شیعر

ENDESE



بەختیار عەلی

# ئەی بەندەری دۆست
# ئەی کەشتی دوژمن

شیعر

ENDESE



بەختیار عەلی

# ئەی بەندەری دۆست
# ئەی کەشتی دوژمن

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: شیعر
نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٨٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٠٥٧)ـی ساڵی (٢٠١٤)ـی پێدراوە.
ISBN: 978-1-63068-952-0



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

# پێڕست

# کە ئێوە وندەبن

ئێوارەیەک کە خوێنی من وەک هەموو ئێوارەکانی دی پڕبوو لە ئەستێرە
ئێوارەیەک وەک هەموو ئێوارەکانی دی، پڕبووم لە گوڵی وێران.
وەک هەموو ڕۆژەکانی دی، دڵم پڕبوو لە باڵندەی ون ...
پڕبوو لەو غەمانەی بەرەو قووڵایی خەراباتی من دەچوون ... لە ڕێگای سەفەردا تا وێرانەکانی خۆم، خەراباتی ئێوەم بینی ... بەلای هەر باغێکدا تێپەڕیم، لەبری پاییزی خۆم، خەزانی خەڵکی تر هاتە ڕێگام. تەپوتۆزی ئێوە هەوای ئێوارە ساردەکانی من بوو... کە لە درەختە سووتاوەکانی خۆم نزیکبوومەوە، هاواری میوەی برینداری ئەوانم بیست ... کە گەیشتمە سەر گۆڕی خۆم و دەستم لە لاشەی خۆمدا... خوێنی ئەوان و ئێسکی ئەوان کەوتە بەر دەستم...

ئێستا تێدەگەم هەر ڕۆژێک کە دەژیم...
مـن ناژیـم... بەڵکـو ژیانـی مـن، تێپەڕینـی تارمایـی ئێوەیـە، دوور لـە خـۆی بـە نیشـتیمانی منـدا. تێپەڕینـی ڕۆحـی غەمگینـی ئێوەیـە دوور لـە خـۆی... نامـۆ لـە خـۆی بـە ڕۆژانـی منـدا.

# شاعیرەکان دەچن بۆ جەهەنەم

شـاعیرەکان دەچـن بـۆ جەهەنـەم. وەک چـۆن پیاوکـوژەکان و دزەکان سـەرتاپا لـە بەهەشـتن.
جەهەنەم شوێنی ئێمەیە
ئەفسوس هەموو ئەوانەی لە ئازار تێناگەن، بە ڕاستی دەچنە بەهەشت
ئەوەی لە جەهەنەم ڕادەکات ئەوانەن کە وادەزانن بەهەشت بەختەوەری لێیە
بەڵام بەختەوەری لە ناو ئەو کتێبەدایە کە پێکەوە خۆڵەمێشەکەی دەخوێنینەوە.
لە ناو ئەو حەرفە سووتاوانەدایە، کە بۆمان نابنەوە بە وشە.

نا... شاعیرەکان ناچن بۆ جەهەنەم ... بەڵکو خودا دەیانبات بۆ جەهەنەم
بۆ نەمانبەن بۆ جەهەنەم؟ نە مرۆڤ و نە فریشتەکان ناتوانن ئاگر بخوێننەوە.
تەنیا ئێمەین دەتوانین ئاگر بنوسین و ئاگر بخوێنینەوە.

شـاعیرەکان دەچـن بـۆ جەهەنـەم، جەهەنـەم شـوێنی دەسـتپێکردنی هەمـوو قەسـیدەکانە.
ڕیتـم چییـە جگـە لـە ئاگرێـک کـە لـە دڵمانـدا دەسـووتێت. کێـش چییـە جگـە لـە دەسـتگرتن بـە کڵپـەوە تـا نەکەویـن.
لـە ئاگـردا نەبێـت، ناتوانیـن ڕووی ڕاسـتەقینەی خۆمـان ببینیـن، لـە دۆزەخـدا نەبێـت بـۆ ئێمـە ئاوێنـەی لـێ نییـە...
دەبێـت بچیـن بـۆ جەهەنـەم، لـە ئاگـردا نەبێـت دەرگای ڕۆحـی ئێمـە ناکرێتـەوە. لـە ئاگـردا نەبێـت ئێمـە نەغمەمـان پـێ نییـە
وشـە ڕاسـتەقینەکان لـە دۆزەخـدان. هاوڕێـم بابڕۆیـن بـۆ ئـەوێ... مـن لـەدوورەوە دەبینـم
بەهەشت بێدەنگە، خاڵییەو قافییەی لێ نییە.

# لە هیجای مانگدا

چ مانگێکە تووشی ئەم دەردەی کردویت، ناتوانیت ئاسمانە خەیاڵییەکانی خۆت ببینیت. چ مانگێک وادەکات سەراپا تریفەی خۆت لێونبێت و شەوی خۆت نەبینی..

هەر لاشەیەک لە ژێر تریفەدا دەدۆزینەوە، یەکێک دەڵێت : ئەوە مانگە بە تریفە دەمانکوژێت، ئەوە مانگە بە تیشک ڕۆحمان ئازاردەدات.

مانگ هیچ نییە جگە لە دوژمنێک بۆهەر شوێنێک بڕۆین تەماشاماندەکات.

دەمەوێت بچین بۆ شارێک مانگی لێ نەبێت. بۆ شەقامێک تریفەی نەبینیبێت

بەسە ئەی مانگ ... تۆ لە بەردێک دەچیت یەکێک لەدوورەوە تێیگرتبین

لەمێــژە لەگــەڵ قافڵەکانــدا دەڕۆم و ســەربەرزناکەمەوە، مانــگ بــەرەو دواوە بانگماندەکات، تـا ئـەو شـوێنەی زوڵمـەت هـەزار فەرسـەخ پێشـمان دەکەوێـت، مـن هـەزار شـار بـەرەو دوا بـۆ مانـگ گەڕامـەوە، هـەزار بـاغ، هـەزار حیکمـەت بـۆ ئـەو پاشەکشـێمکرد... تاسـەر سـنووری عـەدەم ڕۆیشـتم و دەسـتم بـۆ ڕوناکـی ئـەو بـرد... بـەڵام بـۆم نەگیـرا.

بیرکردنـەوەی زۆر لـە ڕوناکـی گومڕایکـردم. سـەیرکە هەرچـی کوفرێکـم هەیـە، ئەمـڕۆ لـە تریفـە دەچێـت.

مانگ، هیچ نییە جگە باڵندەیەک، بۆ هەر شوێنێک بڕۆم پەلامارم دەدات

دەمەوێــت بگەمــە دورگەیــەک مانگــی لــێ نەبێــت، لــە ســەر بەردێــک دانیشــم تریفــەی نەبیســتبێت.

مانگ لە تەنیایی و پیری خۆمان دەچێت، فڕیبێت...

لە مردنی من دەچێت، تا ئاسمان سەرکەوتبێت...

# لە گەورەیی شتەکان ڕادەمێنم

گەورەیە ئەم ئەستێرەیە ... کە ئەو هەموو تیشکەی تیا جێدەبێتەوە
گەورەیە ئەم دلۆپە ئاوە کە بەم بچوکییە، خۆی بە منداڵی دەریا دەزانێت.
گەورەیە ئەم تیشکە کە لە مێژە لە ئاسماندا وێڵە و ئێستاش خۆری بیرنەچۆتەوە.
گەورەیە ئەم کێڵگەیە کە ئەگەر بێتە بەر، پڕە لە سێوی نەبینراو.
گەورەیە ئەم غونچەیەی کە ئەگەر بگەشێتەوە، پڕە لە باغی نەوتراو.

وەرە هاوڕێم، پێکەوە سەیری گەورەیی چڵێک گیا بکەین
پڕە لە گوڵی گێژەن، لە هەناسەی پڕ غەمی گەرداو
لە گەورەیی کۆترێک ڕامێنین،
دڵی پڕە لە جەنگەڵی بچوک.. لە گوللەی کتوپڕ... لە هەڵفڕینی لە ناکاو.

بەڵام لە هەموو شتێک گەورەتر هاوڕێم مردنە...
کە دەرفەتمان دەداتێ، ببین بە گوڵ، ببین بە هەور، ببین بە ئاو
لەسەرمان دەوەستێت ... پڕبین لە عەتری عەشق، پڕبین لە مۆسیقای هەتاو
کاتێک لە جوانی تێربووین، بە میهرەوە وەک دایکێک بانگماندەکات :
وەرنەوە بۆ باوەشی من ... وەرنەوە بۆ باوەشی من... ئیتر تەواو

# چەند ڕۆژێکە وەك دەریاچەم

چەنـد ڕۆژێکـە ماسـییەکانم بۆنـی سـفرەی سـوڵتانەکانیان لێدێـت. چەنـد ڕۆژێکـە لـەدوورەوە قولاپێکـی پیـر دەبینـم بـە ڕۆحمـدا هاتۆتەخـوار ... چەنـد ڕۆژێکـە شـتێک لـە ئەسـتێرە دەچێـت کەوتۆتـە نـاو دەسـتم ... چەنـد ڕۆژێکـە سەرتاپا ڕەش وەکـو خەتـام ... چەنـد ڕۆژێکـە دەنگێـک لـە دوورەوە دەڵێـت، مـن قووڵـم و مـن وەکـو مـردن وەهـام ... چەنـد ڕۆژێکـە شـتێک لـە مەیتـی ماسـیگرێکی حەکیـم دەچێـت کەوتۆتـە لام ... سـەیری مردنـی خـۆی دەکا و بـە مـن دەڵێـت: مـن چ شـەوێکی دڵڕەقـم، مـن چ ئاوێکـی بێوەفـام.

چەند ڕۆژێکە لە تابووتێکی شین دەچم، پڕم لە باڵندەی مردوو. چەند ڕۆژێکە بەردەکانم لە ئەستێرەی غەمگین دەچن. ژەهرێک ڕژاوەتە نیگام. واهەستدەکەم جگە لە مردووەکان، ماوەیەکە کەسی دیکە نایەنە لام، گوڵەکانم لە خۆڵەمێش دەچن، خاڵی لە گۆرانی و سەفام، کوێرم و مرواری خۆم نابینم، لە هەموو تروسکەیەک دوورم، لە هەموو ڕوناکییەک
ڕەهام، پەشیمانم لەم وردە شەپۆلانە... دەڵێیت لە هەنسک و غەمم، دەڵێیت لە ئاگر و هەوام.

چەند ڕۆژێکە سەر لە کەناری خۆم دەرناکەم، بووم بە جۆگەیەکی نەفام. چەند ڕۆژێکە خوێن لە ڕۆحم دەتکێت وەکو نەی وام. دەڵێیت بووم بە گوڵی مردوو، بووم بە خۆڵەمێشی نەمام. دەڵێیت دەروێشێکی گەمژەم، شەو و ڕۆژ لە زیکر و سەمام... دەڵێیت دەمەوێت بفڕم، دەڵێیت لە زەوی نیم و لە هەورام.

# شەوێك كە لە شەو زیاتر هیچی دی نییە

نـە مانگەشـەو و نەگـەرداو، نـە ئەسـتێرە، نـە بـاران ... هیچیانـم نییـە. شـەوێکم تاریکـی ڕاستەقینەی خـۆم دەژیـم. لێـرە نـاڕۆم مـن خـۆرم نییـە. تـۆ ئـەی ئـەوەی بـۆ ڕۆحـی خـۆت دەگەڕێـت، لـە منـدا مەگـەڕێ، مـن نـە ڕوو، نـە ئاوێنـەم نییـە.

ئەی تاریکی ڕەها شەوێکی لە من شەوتر، لە خەیاڵی تۆدا نییە.

شـەوێک کـە مـرۆڤ بـە چـرا بـۆی نادۆزرێتـەوە، بـە نـورا پێینـاگات، دەرگای لەسـەر ڕوناکـی نییـە.

شـەوێك وەک سـندوقێکی داخـراو، نـە قفـڵ و نـە کلیلـی نییـە. شـەوێك وەک شـەوەکانی دی، کڵاو ڕۆژنـە و پشـتخان و پەنجـەرەی نییـە. شـەوێک کـە لـە زینـدان ناچێـت، وەک زینـدان پاسـەوانی نییـە.

شەوێک تەنیا خۆیەتی و لە تاریکی خۆی زیاتر، کەسی نییە.

شـەوێک کـە لەسـەر خـۆی دەنوسـێت، لـە نـاو خۆیـدا دەنوسـێت، دژی خـۆی و لەگـەڵ خۆیـدا دەنوسـێت. لەگـەڵ خۆیـدا دەڕوات، تەنیـا و تەنیـا لەگـەڵ خۆیـدا دەگەڕێتـەوە... شـەوێکە هاوڕێـی نییـە. شـەوێک تاریکـی دەخوێنێتـەوە، تاریکـی سـەفتەدەکات، تاریکـی دەخاتـە سـەریەک، تاریکـی دەخەوێنێـت، تاریکـی بۆنـدەکات، تاریکـی لەخەوهەڵدەسـتێنێت، جگـە لـە تاریکـی نـە دەفتـەر، نـە مەرەکەبـی نییـە. شـەوێکە تاریکیـمان پێشکەشـدەکات، تاریکیـمان بـە دیاری دەداتـێ، تاریکیـمان بـۆ دەکات بـە کتێـب، تاریکیـمان بـۆ دەکات بـە بـاغ... جگـە لـە تاریکـی گوڵـی تـری نییـە.

شەوێک، تەنیا دەتوانێت خۆی بکوژێت، چونکە لە خۆی زیاتر دوژمنی نییە
تەنیا لە دەرگای خۆی دەدات، چونکە جگە لە خۆی میوانی تری نییە

ئـەی دۆسـت... ئـەو شـەوە منـم ... منـم... کـە لـە تاریکـی زیاتـر هاوڕێـم نییـە.

## ئەمە تۆیت ئەی ڕوناکیی مەست؟

ئەمە تۆیت ئەی ڕوناکیی مەست؟... تۆیت کە لە شەرابی هەزار باغت خواردۆتەوە و هاتوویت. ئەمە تۆیت، ئەی تیشکی سەرخۆش... لە مەیی هەزار لالەزارت نۆشیوە و هاتوویتەتە لای ئێمە. ئەمە تۆیت؟ هاتوویت خوێنمان ڕوناکبکەیتەوە، شەرابمان بە باسی خودا لا شیرینبکەیت... ئەمە تۆیت هاتوویت بە مەبەست... ئەمە تۆیت ئەی ڕوناکیی مەست؟

ئەمە تۆیت سووریت لە شەرمی مەستەکان، لە سێبەرتا هۆشی دەمانی دی و هوشیاری دوێنێت دەبینم... حیکمەتی عاقڵانەی جاران. یاریکردنی کۆنت ... گۆرانی و مەستی و هەستەکان، ئەمە تۆیت هاتوویت دەست بە دەست، ئەمە تۆیت ئەی ڕوناکیی مەست؟

ئەمە تۆیت لە شەو دەترسیت، دەتەوێت بێیتە دڵمانەوە تا بۆ ئەبەد هەڵتگرین، دەتەوێت لە خوێنی خۆماندا بتشارینەوە، بتخەینە نوتفەمانەوە، لە ئاوی ژیانی خۆمانت هەڵکێشین، لەگەڵماندا تا ئەوبەری تەمەن مەلەبکەیت، لە عەشقدا بە تۆ بسووتێین، پڕبین لەڕۆشنیی ئەڤین، پڕبین لە ئیشراقاتی هەست... ئەمە تۆیت ئەی ڕوناکیی مەست؟

ئەمە تۆیت دەتەوێت ماڵ پڕکەیت لە خەیاڵ، سێو پێشکەشکەیت لە قاپی پڕ نوردا،
شەراب لێوان لێوکەیت لە خۆر، ئاوبکەیت بە میوەی دەیجوردا.

ئەمە تۆیست دەگریت بەم شەوە، ئەمە تۆیت ئەی گوڵشەنی غەمگین، ئەمە تۆیت ئەی لالەزاری پەست ... ئەمە تۆیت ئەی ڕوناکیی مەست؟

ئەمە تۆیت لە سەر هەر سفرەیەک و پیاڵەیەکت هێناوە. ئەمە تۆیت شەرابت هێناوەتەوە بۆ باغ. دەتەوێت غەمی خۆمان بە تێرامان لە قووڵی لالەزار دەرکەین. دەتەوێت پەستیمان بە تێفکرین لە نزیکی یار دەرکەین... ئەمە تۆیت هاتوویت دەست بە دەست، ئەمە تۆیت ئەی ڕوناکیی مەست؟

# هەموو شتێك لە پەنجەرەوە

## «دووبارە وەك شاعیرانی كۆن... لەوەسفی جەنگدا»

/

كە لە پەنجەرەوە دەڕوانم دەزانم جەنگ هەرگیز تەواو نابێت و تەواو نەبووە
لە پەنجەرەوە دەڕوانم و سەیری گوللەی ئەبەدی جەنگەكان دەكەم بە ئاسمانەوە
سەیری بریندارەكانی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەێنێ دەكەم،
بەخوێن و بە زام و بە هەتوانەوە

لە پەنجەرەوە دەڕوانم و دەزانم ژیان چ تۆپبارانێكی گەورەیە
جەنگ لە حەوشەوە دەست پێدەكات و دەڕوات تا دەگاتە ئاسمان
من سەیری مردووەكان دەكەم دێن و دەڕۆن بە بەر بارانەوە
سەیری گوڵە كوژراوەكان دەكەم... بە غونچە و بە دڕك و بە خەزانەوە

لە پەنجەرەوە دەڕوانم و تێدەگەم کە سوپاکان بێپشوو لە شەڕدان
لەشکرە کۆنەکان دێن و لێرەدا دەجەنگن، بە سۆزی جارانەوە
تەپوتۆزی ئەسپ و دەنگی شمشێریان دەگاتە بەر دەرگام
بە قریوەی جەنگ، بە هەلهەلەی ڕەش، بە هاواری خودا، بە ڕەزمی یارانەوە

لە پەنجەرەوە دەڕوانم، خوێن دەبارێت لەسەر سەرتاپای لالەزار
کەس نییە لێرەدا هەستێت و بێت بە فریای شکۆفەی ناو باغانەوە
شەڕ لەدوای شەڕ هەڵدەگیرسێت و دەبینم
مرۆڤ مرۆڤ دەکوژێت، گوڵ گوڵ دەسووتێنێت... بە عەشقی دەروێشانەوە

لە پەنجەرەوە دەڕوانم، شەقام پڕە لە لێزان و لە پسپۆڕ و لە فەیلەسوفانی جەنگ
هەموو هاتوون بە پێکی ڕەش، بە جلی ڕەش، بە خەندەی وەحشیانەوە
بۆنی باروت و هەوای خوێنینیان دەگاتە ناو خوێنم
سوژدە بۆ ئێسک و برین دەبەن، بە حەسرەتی سوختە، بە جۆشی هەوادارانەوە

لە پەنجەرەوە دەبینم، تاریکە گوزەر و ڕوو لە وێرانەیە کۆڵان
سەعاتی مەرگە لێدەدات، لەبەر ماڵ و لە ناو باغ و بە لقی دارانەوە
کوچە سەراپای سواران و زرێپۆشان و سەربازانی دڵڕەقە
هەموو سەداکوژن بۆ نەغمەی بولبول، نیشانەپێکن بە دڵی گوڵستانەوە

لە پەنجەرەوە دەڕوانم، پادشاکان دەبینم، وان لە مەعدەنی شەیتان
حەزیان لە زەوی وێران و ڕەنگی ئاسمانە بە وێنەی ئاگربارانەوە
شەیدای بۆکرِوزی ڕۆحن و شیفتەی ئالودەبوونی خاکن
شوکرن بە ئەتکی خەرامان و مەستن بە خوێناو و شادن بە ناڵەی بریندارانەوە

لە پەنجەرەوە دەبینم ، دەسووتێت کێڵگە و دەخنکێن پاساری و گەنم و میوەکان
ئەهریمەن دەگەڕێت بۆ بزەی گوڵەباغ، بە نیگای تاریک و بە خوێنی سەر دەستانەوە
کۆتر دەبینم دەفڕێت و عەشقی خۆی لەگەڵ باڵیدا دەبات
درەخت دەبینم دەسووتێت و ناکەوێت و دەمرێت بە وەستانەوە

# جاران

جاران تەنیا دوژمنان دەیانویست بتکوژن... ئێستا هەم یاران و نەیاران
جاران تەنیا دوپشک و مارەکان دەیانویست پێتەوە بەن، ئێستا هەم گوڵ و هەم غو نچە
چ خۆشحاڵن لەم شارە دەرتکەن، بەبێ خۆت و بەبێ بار و بەبێ بەرگ
ماوەیەکە جگە لە گەمارۆی پادشاکان، عاشقەکانیش دەیانەوێت گەمارۆتبەن
هێندە جوان بوویت،
کامڵ بوویت بۆ تیرێکی کتوپڕ، وەک میوە گەیوویت بۆ مەرگ

جاران تەنیا گوللە زامداریدەکردیت... ئێستا هەم تیر وهەم بەرد و هەم نەشتەر
جاران تەنیا شیعرەکانیان دەسووتانیت... ئێستا هەم دەستت و هەم ڕۆحت و هەم سەر
ماوەیەکە جگە لە پەلاماری هەور، بەهاریش پەلامارت دەدات

ماوەیەکە بۆ ئەم دەستە سپییانە، بۆ دڵە پاکەکانی دوێنێش هاتوویتە بەر
هێندە جوان بوویت
کامڵ بوویت بۆ کۆچێکی دوور و پێگەیوویت بۆ سەفەر

جاران تەنیا لە هەندێ کوچە دەریاندەکردیت، ئێستا بوویت بە تەیرێکی نەخۆش، بەبێ شوێن ... بەبێ لانە ... بەبێ باڵ. هێندە جوان بوویت ... باشیت بۆ تڤی ئەمڕۆ ... کامڵ بوویت بۆ نەفرەتی ئەم ساڵ.

جاران تەنیا پادشاکان و میرەکان و خواجاکان دەیانویست بتکوژن، ئێستا زاناکان و داناکان و شاعیران. ئەزیزم غەم مەخۆ ... هێندە جوان بوویت ... کامڵ بوویت بۆ ژەهری یار و کامڵ بوویت بۆ خەنجەری دۆستان .

# تەنیا لە کۆتاییدا تێدەگەین

تەنیا لە کۆتایی ڕۆژدا تێدەگەین کە دەکرا خۆر هەرگیز ئاوانەبێت. تەنیا لە کۆتایی ئەم ئاگرەدا تێدەگەین کە دەکرا هەر بسووتێت و خامۆشی نەکەین. تەنیا لە کۆتایی ئەم پێکەنینەدا تێدەگەین کە دەکرا تا مردن پێبکەنین. لە کۆتایی ئەم عەشقەدا تێدەگەین کە دەکرا تا مردن عەشقبکەین. دەکرا ئەم ڕووبارە هەمیشە بڕوات و نەڕژێتە هیچ دەریایەک. دەکرا ئەم ئەستێرەیە بسووتێت و نەگاتە بەیانییەک. دەکرا ئادەمیزاد لێرەوە بڕوات و هەمیشەش ببینین، دەکرا پاییز هەبێت و باغیش ونەبێت لە بەرچاومان.

تەنیا لە نیوەشەودا تێدەگەین کە نیوەشەو گەلێک دووربوو

تەنیا لە نیوەشەودا تێدەگەین کە دەکرا نەگەینە نیوەشەو.

# دەست و خەنجەر

دونیا پڕە لەو دەستانەی کە خاوەنیان نییە. پڕە لەو دەستانەی لە تۆفان بەجێماون. پڕە لەو دەستانەی بۆ جەستەیەک دەگەڕێن کاریان پێبکات. لەو دەستانەی بۆ یەکێک دەگەڕێن پاچیان بداتە دەست، سەنگەریان پێ لێبدات... لە جەنگە درێژەکاندا ڕێگایان پێدروستبکات، ئاڵایان پێبەرزبکاتەوە. لە پێشی گوردانەکاندا بەیداخیان پێهەڵگرێت.

دونیا پڕە لەو دەستانەی جووت جووت ڕوناکی دەکەنە مستیان و بێئەوەی بیرێژن دەیبەن تادەگەنە بەر قاپی شەو. پڕە لەو دەستانەی شیری تەنهایی دەخۆنەوە، ئاوی تەنهایی دەکەنە مەرکانەوە، هەنگوینی تەنهایی دەردەهێنن. شەرابی تەنهایی دروستدەکەن .

دەستم بینیوە تاریکی دوێنێی وەک ژەهر کردوە بە لێوی ڕوناکی ئەمڕۆوە، بە شمشێری سوبحێک هەموو بەیانیانی دونیای سەربڕیوە

ئاه... خەنجەریشم بینیوە بە دوو لێو، بەلێوێک ئێمە و بەلێوێک خۆی کوشتووە.
خەنجەریشم بینیوە بە دوو دڵ، بە دڵێک من و بەدڵێک تۆی خۆشویستوە

دەستم بینیوە لەگەڵ ڕۆحدا تێکەڵبووە، ویستوێتی وەک هێرۆ گوڵ دەربکات، هێندە لە خەلق و دروستبووندا قاڵبووە، ویستوێتی تۆ، ویستوێتی من ... وەکو یەک دروستکات.

# مردن

ژەنراڵـەکان نەخشـەکان دەکەنـەوە و بەرلـەوەی سـەیری گۆڕەپانـی جەنـگ بکـەن دەمـرن. لەسـەر کورسـییەکی گـەڕۆک لـە گۆڕەپانـی شـەڕدا پاڵدەدەنـەوە، پێـش ئـەوەی پۆسـتاڵەکانیان داکەنـن، پێـش ئـەوەی سـەیری دووربینـەکان بکـەن، پێـش ئـەوەی دوژمـن ببینـن... دەمـرن

سەربازەکان تفەنگەکانیان دەردەهێنن
بەرلەوەی تەقەبکەن
بەر لەوەی سەنگەر لێبدەن ...
بەرلەوەی فیشەکەکانیان بژمێرن ...
بەرلەوەی بزانن دوژمن ڕووە و کوێیە... دەمرن

فریاناکەون سەیری ئەستێرەبکەن، فریاناکەون کۆڵەپشتەکانیان داگرن

بەر لە دەستپێکردنی هێرش، ئەوەتا گۆڕەپان پڕە لە لاشەی سەربازان ...
بەبێ برین، بەبێ خوێن، بەبێ گوللە مردوون.

خودایە، بەبێ ئەوەی دەنگی خومپارەبێت، بەبێ ئەوەی دوژمن پێ بزانێت، بەبێ ئەوەی تیرئەنداز و تۆپەکان ناڵەیان لێوەبێت... ئەم هەموو لاشەیە چییە؟

* ئاه... پێدەچێت ئەی دۆست نەزانیت؟ گەورەترین کوشتار بەر لەدەستپێکردنی جەنگە. خوێناویترین شەڕ، بەر لە گەیشتنی ئێمەیە بە سەنگەرەکان. کوشندەترین برین، دەکەوێتە پێش بینینی نەیار و پێش گوللەی ڕەقیب و پێش تۆپی دوژمنان.

# تـەنهایـی

تەنهایـی ئـەی ئـەو ئەسـتێرەیەی کـە بـاوەڕم پێتـە، ئـەی دوا مەرهەمـی زێڕیـن کـە دەتـدەم لـە مردنـم. تـۆ دوا خوێنیـت کـە مـن سوێندت پێدەخـۆم، ئـەی دوا نەتـەوەی مـن... ئـەی بـرای ئەبەدییـم.

بەرلـەوەی شـەو دابێـت، مـن تەنهـام. بەرلـەوەی خـۆر هەڵبێـت... مـن تەنهـام. بەرلـەوەی بـەر تـەوری زێڕینـی هـەر بایـەک بکـەوم کـە لـە کوشـتنی سنەوبەرەکان دێتـەوە، لێـرەدا لـە چاوەڕوانـی هەمـوو شـێوەکانی مردنـدا دەوەسـتم و تەنهـام.

تەنهایـی... ئـەی باغـی دوا ئیـمان، ئـەی دواڕێـگا کـە دەشـێت پێغەمبەرانـی لێوەبێـت، ئـەی دوا شـار کـە دەشـێت خـودا ڕووی تێبـکات، ئـەی دوا زەردەخەنـە کـە دەشـێت لـەم ئێوارەیـەدا مابێـت... ئـەی دواهەمیـن سـفرە، ئـەی دواهەمیـن ئێشـوو، ئـەی دواهەمیـن نـان.

تەنهایی... من دوا مرۆڤم کە دەمەوێت وەک دواگوڵ بژیم، پێویستیم بە ئایەتی تۆیە. گەر سورەتێکی نوێ لە ئاسمان بێتەخوارێ، تەنیا تۆ بۆم دەهێنیت. گەر بارانێک مابێت، بتوانێت وجودم تەڕبکات... تەنیا بارانی تۆیە.
تەنیا تۆ ئەبەدیت... مردن دڵۆپێکی تۆ و ئەبەدییەت خۆی سێبەری تۆیە.
ئەی تەنهایی ... من دوامرۆڤم، دەمەوێت وەک دوا خۆر بمرم، پێویستیم بە تیشکی تۆیە.

تۆ لە ڕۆحی یەکتردا، لەدەستی یەکتردا، لە چاوی یەکتردا دەبینین...
بۆیە دەتوانین لەگەڵ یەکدا بژین

لەسەر ڕۆحی ئەوانە نەبێت کە تۆ دەیانکوژیت، تائێستا لەسەر ڕۆحی کەس ئەستێرەم نەبینیوە

ئـەی تەنهایـی کلیلەکانیشـت ببەخشـم، کـەس ناتوانێـت دەرگاکانـت بکاتـەوە ... تـۆ تەنیـا نهێنـی منیـت کـە دوژمنەکانـم ناتگەنـێ... تەنیـا بورجـی منیـت تـا ئەبـەد سـوپایەک ناگاتـە بـەردەرگات ... تەنیـا کتێبـی منیـت کـەس ناتوانێـت بتکڕێـت و کـەس ناتوانێـت بتخوێنێتـەوە. مـن دەزانـم هەمـوو عەتریشـت ببەخشـم، کـەس ناتوانێـت گوڵـی تـۆ بناسـێ و باغـی تـۆ بدۆزێتـەوە.

# ئەی نەفامەکان،
# بەهارێکی گەورەتان بۆ دروستدەکەم

هیچ شتێک لە دروستکردنی بەهار ئاسانتر نییە. هوشیاری خۆت بکوژێنەوە، دونیا دەبێت بە لالەزار، عەقڵ بۆ ئێستێک خامۆشبکە، زەوی لە بەرچاوتدا دەبێت بە باغ، بە گوڵ، بە بەهار ...
وەرە و زۆر ئەزێتی هۆشی بەستەزمانت مەدە و لەگەڵمدا باغی گەمژەکان دروستبکە.

ڕۆحی خۆم دەکوژێنمەوە و چیمەنێکی لێدروستدەکەم، بە کەڵکی ئاهەنگی ئەم هەموو نەفامە بێت... ڕۆحی خۆم دەکوژێنمەوە و دڵێکی گەمژەی دەخەمە شوێن، من بیرتاندەکەم... بیری بەهارە گەمژەکانتان دەکەم ... تاقەتم لە بەهارە ڕەشپۆشەکانی خۆم چووە... بیری باغە بێهۆشەکانتان دەکەم

بۆ گوڵێک دەگەڕێم بتوانێت بیرنەکاتەوە، کێ باغێکی هەیە غونچەکانی بیرنەکەنەوە، بیسپێرێت بە من... ئەی برام، من پێمخۆشە، ببم بە باغەوانی هەموو گوڵە بێهۆشەکان.

ڕۆحی خۆم دەکوژێنمەوە و گۆمێکی لێدروستدەکەم، بشێت هەموو نەفامەکان تیا مەلەبکەن. دڵی خۆم دەکوژێنمەوە و شەقامێکی لێدروستدەکەم، بە شاری گەمژەکاندا بڕوات.

ئیدی سوار شەمەندەفەرێک نابم بە شاری تۆدا بڕوات ئەی عەقڵ.

نامەیەک ناکەمەوە لە شاری تۆوە هاتبێت ئەی عەقڵ...

من کوڕی شاری گەمژەکانم و ئیدی ڕەقیبی تۆ دەبم ئەی عەقڵ.

# شوێنی خۆت لەم کارەساتەدا بەرمەدە

شوێنی خۆت لەم بایەدا بپارێزە، شوێن دەستەکانت لەسەر ئەم تابوتەی کە لاشەی خۆشەویستیی تێدایە. ئەم کفنە کە عەشقمان تیاهەڵگرتووە. ئەم گۆڕە کە سۆزی خۆمانی تیا دەنێژین. دەست بەم مەیتەوە بگرە... لێرە بەدواوە تەنیا بەسەر لاشەی شاعیراندا دەڕۆین... بەناو خوێنی ڕژاوی ئەواندا تێدەپەڕین... لێرەوە گۆڕەکان پڕن لە حیکایەتخوانی خنکاو... لێرەوە بەسەر لاشەی سۆفییەکاندا هەنگاودەنێین... گوێ لە هاواری ئەو خەڵوەتانە دەگرین کە مەنجەنیقە زەردەکان پەلاماریاندەدا. هاواری ئەو مزگەوتانەی خودا بەدەستی خۆی دەیانڕوخێنێت. ئالێرەدا سوڵتانی خەرابات لەسەر پێستی ئێمە زەخرەفەی مردن دروستدەکات ... لەسەر شانمان تەیری مردن دەنیشێتەوە. لێرەوە چاومان لە هەرەسی منارەکانە بەسەر ئێماندا دەڕوخێن... چاومان لە مەلەکوتە کە بەسەر خودا و فریشتەکاندا دەڕوخێت.

شوێنی خۆت لەم گێژەڵوکەی تەنهاییەدا بگرە... سوار هیچ کەشتییەک مەبە، من خۆم لاشەی نوحم لەسەر ئاوەکان بینی، ئەم تەرمی خۆشەویستییە بدە بە شانتدا و بوەستە، مەهێڵە هیچ ڕۆحلەبەرێک شوێنت بگرێت. لێرە بەدواوە ئەو بەندەرانەی بۆ چاوەڕوانی تیا دەوەستاین، دەبن بە ژێر ئاوەوە، دەست بە ژێرپێی خۆتەوە بگرە. لێرە بە دواوە ئەو کۆشکانەی بە بەرد، بە ڕەنج، بە خوێن، بە وشە دروستمانکردن دەڕوخێن. ئیدی لێرەوە بەناو خوێنی خۆماندا دەڕۆین ... دە بڕوانە خودا بە چ ڕەنجێک بولبولەکان کوێردەکات... بڕوانە ئەو چ نائومێد گڵ دەکات بەسەر خۆیدا... باغی خۆی خاپووردەکات.

دەست بەم میوەیەوە بگرە. ئەمە دوا هەرمێیە کە خودا سەوزی دەکات... دوای تۆزی ئەم وێرانەیە، تەنها غوبار هەیە بیخۆین. لەمڕۆوە سێو نامێنێت، بۆنی خوێنی لێ نەیەت. لەمڕۆوە هەرمێ نامێنێت، قەپاڵی لێبگرین و هاوار نەکات.

ئەوانەی لەسەر خوانی پاک دانیشتوون، بە ئاوی زولالی ئەم کانییە دەستنوێژ دەگرن، جبەی شالیارانیان لە شاندایە... سبەینێ بە بێ خوان لەسەر ئێسکی یەک دادەنیشن... بە خۆڵ دەستنوێژ دەگرن ... تۆز دەدەن بە شانیاندا.

شوێنی خۆت لەم کەنارەدا بەرمەدە، دەریا لێرەدا دەوەستێت و ناڕوات.
کەشتی ئەمڕۆ لێو بە کەنارەوە دەگرێت، نوقم نەبێت
گوڵ دەست بە کێڵگەوە دەگرێت، نەکەوێت
بولبول دەنوک بە باغەوە دەگرێت، با نەیبات.

# جەنگەکانی من

مـن لەگـەڵ هەمـوو جۆرەکانـی خەنجـەردا لـە پەیمانـدام. تەنیـا بـۆ کوشـتنی خـۆم بیانوەشـێنم. مـن ئـەو داری ئازادییـە نیـم بـە خوێـن ئـاو بدرێـم، ئـەو غونچـەی سەربەسـتییە نیـم بـە خوێـن بگەشـێمەوە، مـن بڕۆمـە گۆڕەپانـی هـەر شـەڕێکەوە، بۆئـەوە نییـە بکـوژم، بەڵکـو بۆئەوەیـە بکوژرێـم و بـە زیندوویـی نەگەڕێمـەوە.

مـن لەگـەڵ هەمـوو تفەنگەکانـدا لـە پەیمانـدام، تەنیـا بـە هـەوادا و ڕووە و دەرەوەی زەوی بیانتەقێنـم. لـە پەیمانـدام چەقـۆ بـە ئەلفبایەکـی تـر بنوسـمەوە. مـن هەمـوو ڕێگایـەک بـە مەبەسـتی مـردن دەگـرم، هەمـوو ئاوێـک بـە هەسـتی ژەهـر دەخۆمەوە.

هەمـوو پلانـم ئەوەیـە دوژمنەکانـم سـەرکەون، شـادبن، غەریزەکانیـان لـە مردنـی مـن تێربکەن.
هەمـوو نیـازم ئەوەیـــە باڵندە برسـییەکان، ئەوانـــەی ڕق لە نـــاوەوە دەیانـــخوات، لـــەدەوری

لاشـەکەی مـن کۆببنـەوە. خێـڵە سیـاپۆشەکان بێـن و لـەدەوری لاشـەی مـن هەڵپـەڕن، باغـە
شـەڕانگێزەکان لـە برینـی منـدا گوڵـی خۆیـان بدۆزنەوە. مـن لەگەڵ هەمـوو جۆرەکانی خیانـەت و دڵڕەقیـدا لـە پەیمانـدام، مـن بکـەن بـە ڕەشنوسـی خۆیـان، مـن بکـەن بـە لابـوری خۆیـان، بەدەسـت و خەتـی خۆیـان تـا دەمرم، خوێنـی مـن بنوسـنەوە.

ئـەی ئـەوەی تـا ئێسـتا چەقـۆت لـە گۆشـتی کـەس نـەداوە، دڵـی مـن باجـی لەسـەر نییـە... زۆر کـەس بـە کوشـتنی مـن بـوون بـە ئوسـتاد، وەرە و تـۆش ببـە بـە ئوسـتاد. چەنـد دەتوانـی قووڵـتر خەنجەرەکـەت ڕادە... سـەربڕینی مـن یارییـە ... هـەر ئەمـڕۆ نـا ... لـە مێـژە گۆشـتی مـن هەڕاجـە ... لـە مێـژە خوێنـی مـن خۆڕاییـە.

# ئەم شارەم لە بیر نییە

لە بیرم نییە چ باڵندەیەک فریوی دام و هاتم بۆ ئەم شارە.
لە بیرم نییە چ پاسەوانێک لەسەر دیوارەکانەوە بانگیکردم
لەبیرم نییە چ زنجیرێک، چ کۆتێک، وەها زێڕین و قەشەنگ بوو، ئەم زیندانەی لا خۆشەویستکردم ... من ڕێگای ئەم شارەم لەبیر نییە ... لەبیرمە بۆ مردن لە ژێر سێبەری درەختێکدا هاتم ... بەڵام ئێستا ناوی هیچ درەختێکم لەبیر نییە ... بۆ مردن لە نزیک بۆنی گوڵێکەوە هاتم ... بەڵام ئەمڕۆ، بۆنی هیچ گوڵێک لەخەیاڵمدا نەماوە، ڕەنگی هیچ غونچەیەکم لە یاد نییە.

لە تۆ دەپرسم ئەی ڕاگوزەر وەک با... ئەی غەمگین وەکو ئاسمان
ئەوە تەنیا منم کە نازانم، بۆ هاتووم بۆ ئەم شارە
یان تۆش نازانیت کە ئێمە چین و چ چیزەین و چ کارە

لـە بیـرم نییـە چ ئیمپراتۆریەتێکـی سـپی، کـە پڕبـوو لـە درەختـی ڕەش، لـە کۆتـری سـیا وەکـو قەتـران، لـە ماسـی سەرشـار بـە سـۆزی ئـاو... لێـرە حاکمبـوون... لەبیـرم نییـە چ بایـەک تـۆوی لـە کێڵگـە تاریکەکانـەوە فڕانـد و منـی کـرد بـە باغەوانێـک کـە تەنیـا بولبـول بـۆ مـردن دەهێنـم... لـە بیـرم نییـە بـۆ بـووم بـە جووتیـار، بـۆ پووچـی دەکێڵـم، بـۆ وشـکی دەچێنـم.

لەبیرم نییە یەکەم جار لە دەروازەی کێم دا،
یەکەم شەو لە ژووری چ میوانسەرایەکدا کەوتم.
یاتاغی چ کاروانچییەکم دا بە خۆمدا،
لەدەنگی چ بولبولێک ڕامام، بە داڕووی چ عەتارێک خەوتم.

لەبیرم نییە بۆ لە شۆڕشەکاندا بەشداربووم، بۆ تەقەم لە خائینان کرد... لەبیرم نییە بۆ کتێبی وەها گەورەم نوسی... بۆ باغی وەها پێچاوپێچم دروستکرد... بۆ بەدەستی ڕووت ئاگرم ڕواند، بۆ خۆم بە ژەهر مەستکرد؟. لە بیرم نییە بۆ بووم بە پادشاهی شیعر، بۆ چووم بۆ ڕاوشکاری هەڵبەست، بۆ ئەم کوچانەم وا خۆشویست، بۆ نوێژم لێرەدا دابەست، بۆ بام لێرەدا هەڵچنی، بۆ شەرابم لە خەزنە تاریکەکان دەرهێنا، بۆ دڵی خۆم فریودا... بۆ لێرە نەڕۆیشتم، بۆ وازم لەم شارە نەهێنا؟.

# بێدەنگی دوای مردنی گوڵێك

بێدەنگن... بەجۆرێک بێدەنگن، هەموو باڵندەکانم دەترسن.
تا ئەو ئەندازەیەی کەشتییەکان لە بێدەنگیدا بخنکێن، بێدەنگن
ئەمشەو منارە ڕەشەکان و بورجە دوورەکان بێدەنگن. جگە لە ئەستێرە کە هەندێجار دەجریوێنێت... پاسارییەکانیش بێدەنگن. بە پێچەوانەی دوێنێوە تۆفانیش ئەمشەو بێدەنگە، وەک مردنی گوڵێک وەها گرنگ بێت، کە نەهەنگە دوورەکان و پڵنگەکانی هاوسێمان بێدەنگبکات، هەموو بێدەنگن. گیاکان بێدەنگن و دڕکەکان. گوللەکان دێن و دەڕۆن بە هەوادا و چرکەیان لێوە نایەت، جەنگ لێرەدا بەبێدەنگی بەردەوامە... بریندارەکان دان بە خۆیاندا دەگرن و بێدەنگن. مردووەکان سەیری زامی خۆیان دەکەن و هاوارناکەن... سەربازەکان بەرەو پێش تەکاندەدەن و بێدەنگن. وەک مردنی غونچەیەک وەها گرنگ بێت، کە هەموو جەنگاوەرانی دونیا بۆی بێدەنگ بن... بێدەنگن.
بێدەنگن ... بەجۆرێک بێدەنگن، هەموو توتییەکانم دەترسن
تائەو ئەندازەیەی ئەستێرە ئاوڕیان لێبداتەوە... بێدەنگن.

هـەزاران مۆسـیقارن، لەسـەر ئـەم شـانۆ مەزنـەی جاویـدی وەسـتاون و بێدەنگـن. کەمـان ئاوازەکانـی خـۆی دەپچڕێنێـت و بێدەنگـە. هـارپ، سـەنتوور، فلووتـەکان نۆتـەی خۆیـان دەکـوژن و خامۆشـدەبن. هەمـووان بەبێدەنگـی لـە ڕۆحـەوە گۆرانـی دەڵێـن، وەک مردنـی شـکۆفەیەک وەهـا گرنـگ بێـت، هەمـوو مۆسـیقارەکانی دونیـا بـۆی بێدەنـگ بـن.

بێدەنگن... بە چەشنێک بێدەنگن، سام لە باغم نیشتووە
تا ئەو ئەندازەیەی هەموو فوارە و تاڤگەکان پێکەوە ڕاوەستن، بێدەنگن

ئەمڕۆ مزگەوتەکان، گومەزە زێڕینەکانی ئیمان بێدەنگن، جگە لە ئیشراقاتی دڵ کە هەندێجار دادەگیرسێت، ناڵەی حەسرەتی سینەش بێدەنگە... پرسەدارەکان بە خۆیان و تابووتە زەردەکانیانەوە دەڕۆن و بێدەنگن. وەک مردنی گوڵێک وەها گرنگ بێت، هەموو فرمێسکەکانی دونیا بێدەنگ بکات، بێدەنگن. وەک کەوتنی غونچەیەک وەها بێت، ئاهووی دوور و گورگە تەنیاکانی هاوسێمان بۆی بێدەنگ بن، بێدەنگن. شمشێرەکان لە هەوادا دێن و دەڕۆن و بێدەنگن. زرکەکان دەچن بە ڕۆحدا و بێدەنگن، زیکرکاران وەک شێت سەمادەکەن و بێدەنگن، وەک کەوتنی شکۆفەیەک وەها گەورەبێت، هەموو دەروێشەکانی دونیا بۆی بێدەنگ بن... بێدەنگن.

# چوون بۆ جەهەنەم

لەمبەری شەقامەوە بە تەنیا دەوەستم، هەموو ئەوانەی دەچن بۆ بەهەشت لەوبەرەوە چاوەڕوانی شۆفێرەکان دەکەن. تەنیا لێرەدا دەوەستم و دەمەوێت سوار ئەو شەمەندەفەرەبم کە دەچێت بۆ جەهەنەم... هیچ پاسارییەک، هیچ گوڵێک، هیچ ئومێدێک لەگەڵمدا سوارنابێت. هیچ هەورێک، هیچ ڕوناکییەک، هیچ عاشقێک نایەت بۆ جەهەنەم... ئەی دۆست، ئەم شەمەندەفەرە گەلێک درەنگ دێت... ڕەنگە هەرگیز نەیەت، ڕەنگە لە مێژە ئەم هێڵە نەمابێت، لەمێژە کەس نەچێت بۆ جەهەنەم...

لەوبەر گەڵاکانی پاییز، کوکوختییە پیرەکان، شاعیرانی چەماوە لە تەنهاییدا، پەپولە سووتاوەکان، نێرگزانی پەژموردە لە غەمدا، هەموو سواردەبن بۆ بەهەشت... تەنیا منم لێرەدا دەوەستم و ماڵاواییدەکەم و دەڕۆم بۆ جەهەنەم.

بەوەدا کەس ناچێت بۆ جەهەنەم، پێدەچێت جەهەنەم لە مێژە نەمابێت.

مـن لێـرەدا لەبـەر ئـەم بارانـەدا دەوەسـتم و بەخـوداکان دەڵێـم گـەر جەهەنـەم نەمـاوە... یـاران جەهەنەمێـک بـۆ مـن دروسـتبکەن.

لـە کـەس ناپرسـم ئێـوە بـۆ دەچـن بـۆ بەهەشـت، بـەڵام دەزانـم ئـەو پشـکۆیەی لـە سـەری مندایـە ... ئـەو کڵپەیـەی لـە ڕۆحـی مـن بەربـووە، دەبێـت بگەڕێتـەوە بـۆ جەهەنـەم.

هاوڕێکانـم هەمـوو لـە جەهەنەمـەوە هاتبـوون. کچـی کۆڵانەکەمـان زۆربەیـان خەڵکـی جەهەنـەم بـوون، شـاعیرە گەورەکانـی دۆستیشـم، پێکـڕا ستایشـی جوانـی جەهەنەمیان دەکـرد... بـەڵام چـی بـووە خودایـە، ئەمـڕۆ کـەس ناچێت بـۆ جەهەنەم؟ ... شـار لـە ڕۆژانـی ئاساییدا پـڕە لـە بۆنـی جەهەنـەم، پـڕە لـە نانـی جەهەنـەم، پـڕە لـە میـوەی جەهەنـەم... بـەڵام ئێسـتا خاڵییـە ئـەم ڕێگایـە... چۆڵـە ئـەم کاروانـە... هیـچ دەنگێکـی لێـوە نایـەت جەهەنـەم.
لـە مێـژە خاپـوورە جەهەنـەم، لـە مێـژە شەرنشـینانی ئـەوێ لـەم سـەرزەمینەدا ئـاوارەن، نەدەچـن بـۆ بەهەشـت، نـەزەوی تێیانـدەگات، نـە ڕێـگای مـاوە جەهەنـەم. مرۆڤـەکان وەهـا کڕبـوون، وەهـا سـوژدەچی و عاقـڵ بـوون... ڕەواجـی نەمـاوە جەهەنـەم.

سەردەمانێ تەنیا مرۆڤە سەربەرزەکان دەچوون بۆ جەهەنەم، تەنیا گوڵەباغە ڕاستەقینەکان کە بۆنیان لە بۆنی گوڵی بەهەشت خۆشتربوو، ئەو کەشتیانەی دەریایان بە هاواری خۆش لە خەو هەڵدەستان، ئەو کۆترانەی وەها لە جوانی تێربووبوون بە شەوقەوە لە باغیان دەپرسی، کامەیە دەرگای جەهەنەم.

سەردەمانێ تەنیا پاپۆڕی داوێنپاک، دوورگەی لە خەیاڵدا نوقم، دەریاوانی دەستپاک دەچوون بۆ جەهەنەم. ئەوانە دەچوون بۆ جەهەنەم کە خودا و شەیتانەکانی ناو خۆیان کوشتبوو، ئەو غونچانەی باغە یۆتۆپییەکانی ناو سەری خۆیان دەسووتان، ئەو غونچانەی بۆ ئێمە دەستیان لە جوانی خۆیان هەڵگرتبوو. شاعیرانێک باسی پاکی و پیسیان نەدەزانی، وازیان لە ئومێد هێنابوو، خودا و مرۆڤیان وەکو یەک تەماشادەکرد ... ئیشسیان ستایشی لێبوردن و خۆفیداکاری بوو... ئەوان بوون دەچوون بۆ جەهەنەم.

٥

ئەمڕۆ لێرەدا دەوەستم و چاوەڕوانی ئەو شۆڤێرە نابم کە ناگات بمبات بۆ جەهەنەم، شوێنێک دروستدەکەم، گەلەک بێتخووب و گەورە. هێدی هێدی ئاگری بۆ دەهێنم، بێدەنگ دەرگای ئاسنینی بۆ دادەنێم، دیوارەکانی تا ئاسمان هەڵدەچنم، ئەڵقەڕێزی لە خەونی خۆم بۆ دروستدەکەم و لە نێویدا دادەنیشم و ناوی دەنێم جەهەنەم.

## من وەك نابینایەك

هەموو شتەکان وشەن، درەخت وشەیە، دەریا وشەیە، خۆر وشەیە
بەناو ئەو شارانەدا دەڕۆم کە لەوشە دروستبوون، بەناو ئەو شەقامە دوورودرێژانەدا کە لە وشە چنراون. بازاڕ و منارەکان وشەن. بەندەرەکان کۆمەڵێک وشەن لە نزیک دەریاوە وەستاون. لەوێوە سڵاو لەو کەشتیانە دەکەم کە کۆمەڵێک وشەی دوورن و چارۆکەیان هەڵداوە، ماسیگرەکان وشەن کە قولاپیان پێیە، ماسییەکان وشەن ، خنکاوەکان وشەن.

من کوێرم، تەنیا وشە دەبیستم... جەنگ وشەیە، وێرانەکان وشەن.

کێ دەتوانێت بە وشە هەور بخاتە خەیاڵمەوە، کێ دەتوانێت بەوشە هەنارم بەدارەوە تیا بڕوێنێت. کێ دەتوانێت بورجەکان لەسەرمدا بەوشە ڕەسمبکات، کێ دەتوانێت بەوشە یاقووتی ژێر دەریام بۆ دەربهێنێت.

من دەبێت دڵۆپ دڵۆپ دەریا بکەم بەوشە، بۆئەوەی تێبگەم
لەسەرمدا هەمیشە چەکوشی ئەو ئاسنگەرانە ئیشدەکات کە وشە دروستدەکەن، دەنگی کورەی ئەو پیاوانەی وشە وەک پۆلا دادەڕێژن، دەنگی ئەو دارتاشانەی وشە دادەتاشن، هاواری ئەو سەپانانەی وشە دەدرونەوە.

لای من
خۆر هەڵنایەت، ئەوەی زەوی ڕۆشندەکاتەوە وشەیە
خۆر ئاوانابێت، ئەوەی تاریکی دروستدەکات وشەیە.

# ژمارەی گەمژەکان

ژمارەی گەمژەکان ، لە ژمارەی گەڵای درەختەکان و پاسارییەکان زیاترن
هەموو کۆتری سەرنشینی ئەم دونیایە، ژمارەیان ناگاتە ژمارەی گەمژەکانی ئەم
شارە

ئەی دۆست... گەمژەکان لێرەدا پادشان، ڕەخنەگرن، حاکمن
مامۆستای ستاتیکان... مۆسیقارن... ڕۆژنامەنوسن... شاعیرن
ژمارەی گەمژەکان، لە ژمارەی ئەستێرەکان زیاترن

گەمژەکان تا دێت زۆرتر دەبن
چ سادە دەتوانن بمکوژن ... ئەی دۆست
من دەمرم و گەمژەکان بۆ هەتاهەتایە نامرن

# شاری درۆ

ئـەی دەریـا، تـۆ بـە ئەنـدازەی گوڵـی درۆزنـی ئـەم شـارە ماسـی درۆزنـت هەیـە؟. پێمبڵـێ، وەک چـۆن شـەقامەکانی ئـەم شـارە درۆیـان لەگـەڵ منـدا کـرد، تـۆش درۆ لەگـەڵ کەشـتییەکاندا دەکەیـت؟ وەک باغەکانـی ئـەم شـارە ئاخـۆ پڕیت لـەو پیاوانەی سـێوی درۆ دەخـۆن ؟ وەک هەیوانەکانـی ئێـرە پڕیـت لـەو میوانانـەی حەزیـان لـە بەیانیانـی درۆ و بەرچاییـە بـە پەرداخێـک لـە شـیری درۆوە؟.

من تێربووم لەسەیرکردنی بورجی درۆ، باغی درۆ
من تێربووم لە سەیری سوارچاکانی درۆ لە جەنگی درۆدا
تێربووم لەسەیرکردنی ماسی درۆ لە ناو حەوزی درۆدا

ئەی جەنگەڵ، تۆ بە ئەندازەی ئەم کوچەیەی ئێمە، هێلانەی درۆت هەیە؟ وەک ئەم کۆڵانەی ئێمە، هێلکەی درۆت خستۆتە ژێر کۆتر؟ پێمبڵێ ئەی جەنگەڵ، بای درۆ ڕۆژی چەند جار هەڵدەکات؟ شاعیرانی درۆزن چەند دیوانیان لە ستایشی خەزانی درۆدا نوسیوە؟ ئەی جەنگەڵ نامەوێت بە سنەوبەری درۆدا بێمە خوارێ و بە سەروی درۆدا سەرکەوم، پێمبڵێ دەتوانم، بەم هەموو ڕاستییەوە هەڵبێم و لەلای تۆ بمرم...مردن لەم شارەدا بۆتە درۆ، ئەی جەنگەڵ، نامەوێت بەدرۆ بمرم.

من تێربووم لەسەیرکردنی گەشبینە درۆزنەکان، غەمخۆرە درۆزنەکان، دڵسۆزە درۆزنەکان.

وەڕزبووم لە مەرهەمی درۆ لە ئەجزاخانەی درۆدا
تێربووم لە ئیمانی درۆ لە ژێر منارەی درۆدا

ئـەی شـاری درۆ، ئاسـنگەرەکانت ئاسـنی سـاردی درۆ دەکوتـن. داربڕەکانـی تـۆ، بـەدرۆ تـەور لـەم باغـە خەیاڵییـە دەدەن. مەسـتەکانی تـۆ بـەدرۆ لـە مەیخانـەدا شـەرابی درۆ دەخۆنـەوە. فەرمانبەرانـی تـۆ، تاپـۆی درۆی ئـەم کێڵگانەیـان پێیـە. باجگرانـی تـۆ، بـە قەپانـی گـەورە خەرمانـی درۆ دەکێشـن... دانەوێلـەی لـە درۆدا ڕەش دەخـــۆن ... دەغــڵی ســووتاو لە درۆدا ...

گەنمێـک نانـی درۆمـان دەداتـێ ... تێشـووی درۆ لـە نانـی جـۆ... هـەرزن کـە باڵنـدەی درۆ دەیخـوات... «کا» کـە بـای درۆ دەیهێنێـت ... پـوش کـە بـای درۆ دەیبـات.

ئیـدی بەسـە، بـە نـاو درۆی ئەبـەدی ئێوارانـدا پیاسـەکردن. پێکەنیـن بـۆ سـاقییەک وەعـدی بـادەی درۆمـان پێـدەدات. کچێـک کـە وادەی ژوانـی درۆمـان دەداتـێ. سـەعاتی درۆ کـە ڕۆژی درۆ دەپێوێـت، نەخشـەی درۆ کـە لەسـەر خاکـی درۆ دەڕوات، فێنکـی درۆ کـە بەیانیانـی بـاغ بـە مسـقاڵ دەیفرۆشـێت، گوێگرتنـی ڕۆژانـەم لـە بێسـتان کـە پڕبێـت لـەو میوانانـەی حەزیـان لـە بەیانیانـی درۆ و بەرچاییـە بـە پەرداخێـک لـە شـیری درۆوە؟

من تێربووم لەسەیرکردنی بورجی درۆ، باغی درۆ.
من تێربووم لە سەیری سوارچاکانی درۆ لە جەنگی درۆدا
تێربووم لەسەیرکردنی ماسی درۆ لە ناو حەوزی درۆدا

# گوێم لە هاوارێك بوو

گوێـم لـە هاوارێـک بـوو، وامدەزانـی دەریایـە و لـە دوور بانگـم دەکات. وامدەزانـی پەنجەرەیەکـی دوورە و لـە ترسـی کۆتـر دەگـری، وامدەزانـی دەنگـی خۆمـە و بـۆ بـای بێسرەوتـی ئـەم شـەو دەدوێـت. وامدەزانـی کەسـێکە و بـە زامـەوە لێـرەدا مـردوە، وامدەزانـی دڵمـەو سـڵاوی لـە مـردن کـردوە. وامدەزانـی بولبولێکـە لەسـەرپەرژینی بـاغ دەگـری، وامدەزانـی یەکێکـە تەلبەنـدی ئـەم زیندانـە دەبڕێـت و ڕادەکات، گووتـم: دەشـێت مردویـەک لـە گـۆڕ هەسـتابێت و دەسـتی بـۆ گوڵێـک بردبێـت. گووتـم: دوورنییـە دارەکان لەبـری گـوڵ ئەمشـەو برینیـان گرتبێـت، گووتـم پێدەچێـت باڵندەیـەک بێـت و باڵەکانـی مردبێـت.

گوێم لە هاوارێک بوو لە دەنگی گەردەلوول دەچوو. گووتم : دیسانەوە دەریایە کەشتی بێگوناهی کوشتووە، دیسانەوە ئەوە، ماسیگر دەگرێت و بەلەمی دەرکردوە ... دیسانەوە ئەوە، پەلاماری کەناری خەوتوو دەدات، ئەوە بەندەر دەفرێنێت و ئەوە بە بارمتە
دوورگەکانی گرتووە. ئەوە دەگری و شەپۆل بەسەر خۆیدا دەکات، ئەوە دەڵێت نەورەسم ڕۆیشت، دەریاوانم مردوە.

وامدەزانی ڕێبوارێکە، بەپرتاو بەرەو ناو تەم ڕادەکات، کەسێکە لە خۆڵەمێشی شارە سووتاوەکاندا گەڕاوە، لە خاشاکی ڕستە و لە خەڵوزی کتێبدا ڕەشبووە. گەیشتۆتە یەقین لە خێڵی هەوا، لە جنسی هەڵم، لە توخمی تەم بووە. بە مەتر و کاغەز و پرگاڵ، عومری خۆی دەپێوێت، دەبینێت گەنجێتیی دوکەڵە، پیرێتیی غوبارە و ونبووە.

# ئەو سەردەمانەی وەکو خەون دەمێننەوە

ئەمڕۆ هەمیشە وەک خەون دەمێنێتەوە، شەقامەکان وەک خەونێکی کاڵ دەمێننەوە، ئەسپەکان و گالیسکە کۆنەکان وەک خەون لێرەدا دەوەستن، کچی قەشەنگ، بە باوەشێنی چینییەوە، لێرەدا وەک خەون تەماشاماندەکەن. ڕێبواری بۆشناخ بە نیگای ئەمیرە غەمگینەکانەوە، بە شمشێرە خوێناوییەکانیانەوە، بە خودەی زێڕینەوە کە لە ڕۆژانی ئاشتیشدا دایناگرن ... هەموویان وەک خەون دەژین و وەک خەون دێن و وەک خەون دەمێننەوە. ئەو سێوانەی بە درەختەوە دەیانبینین، ئەو گێلاسانەی لەسەر فەخفوری شاهان داماندەنان، دۆی سپی لە جامی زێڕیندا، کوپەی پڕ یاقووت لە سەرنوێنی ئاغاکان، کەو کە لە نزارانی پڕ تەمدا دەیانخوێند، کوتاڵچی کە خۆیان پشتێنی ئاوریشمیان دەبەست و لە شاران چیت و ئەنگۆرە و سورمەی کۆنیان دەفرۆشت، هەموو وەک خەون دێن و وەک خەون لێرەدا دەوەستن و وەک خەون بەبەردەمماندا تێدەپەڕن . تەمی سەر شارە گەورەکان و عەتری پاساژە شوشەکانیان هەمووی دەڕوات و دەبێت بە خەون، حیجابی ئەو ژنانەی لە ژێر عەباکانیانەوە ڕووتن، دەڕوات و خەونێکی غەمگین لە جێگای جێدەمێنێت، دەنگی سەرخۆشان کە لە پیاڵەی ڕەشدا دەخۆنەوە ... وەک خەون دەگاتە گوێمان... ئەو شارانەی دەیانگەینێ دەبن بە خەون... ئەو شارانەی نایانگەینێ دەبن بە خەون... ئەوانەی خۆشیان ویستین بوون بە خەون... ئەوانەی خۆشمان ویستن بوون بە خەون.

ئەوەی لەم ژنانە دەمێنێتەوە جوانی نییە، ئەوەی لەم کەشتیانە جێدەمێنێت، بۆنی دەریا و چارۆکە ماندووەکان نییە. بەڵکو بۆنی خەونە... کە دەبێت بە حەقیقەت و دێت و دەڕوا و دەبێتەوە بە خەون.

من کە دەڕۆم بە ناو خەوندا دەڕۆم، کە تۆ دەڕۆیت خەونیت و بەڕێگادا دەڕۆیت.

ئەم کۆترانە خەونن و دەفڕن. لێرەوە تێدەپەڕین و گوێمان لە زەنگی ئەو بورجە دوورانەیە لە خەونماندا لێدەدەن

لێرەوە دەڕۆین و گوێمان لێیە خەونەکانمان لەو شارە دوورانەدا وەک زەنگ لێدەدەن

ئەم شارە هەڵدەستێنم و پێیدەڵێم : هاوار ... ئەی شاری منداڵیم، تۆ وەختە دەبیتە خەون. ئەو مەست و خەواڵوو دەمگرێت و دەڵێت: بێدەنگ بە و بخەوە ... ئەی تاریک ... ئەی ئاڵۆز ... ئەی وێڵگەرد ... وەکو خەون.

# کۆتایی

گەر زەوی تەواوبێت ئاسایيە... زەوی ئەبەدی نییە... ئەوەی تەواو نابێت ئاسمانە بە ئاسۆ غەمگینەکانییەوە.
گەر گوڵ تەواو بێت سەیرنییە... گوڵ ئەبەدی نییە... ئەوەی تەواونابێت باغەکانە.
گەر من و تۆ تەواوبین ئاسایيە... من و تۆ ئەبەدیی نین... گەر ئێمە تاریک بین ئاسایيە... گەر جەنگەڵەکان تاریکبن و شەقامەکان ئێواران دەیجور بخۆنەوە ئاسایيە ... گەر شکۆفەکان ئێواران تلیاکی زوڵمەت بکێشن... مەترسە... ئەوەی تەواونابێت ڕوناکییە. لە خەنجەریش مەترسە، لە لەشی شکۆفەکردوو لە مەرگدا مەترسە... مردن ئەبەدییە. سەیرمکە چۆن بەسەر مینەکاندا دەڕۆم، چۆن دەچمە بەردەمی تۆپ و موشەکهاوێژەکانی جەنگ ... باروت تەواو دەبێت و ئومێدەکانی من تەواو نابن... گەر مینەکان بە لەشمدا تەقین ئاسایيە... با بمرم، من ڕاگوزەر و تێپەڕم ... مەستیم ئەبەدییە.

مـن هەندێـک وشـە لـە خۆمـدا دەبینـم، کـە لەمێـژە دەسـووتێن و نابـن بـە خۆڵەمێـش... بـا وشـەکان بسووتێن و تەواوبـن، ئـەوەی تەواونابێـت ڕەگـی وشـەکان و تـۆوی ڕەشـی ڕسـتەکانە لـە خوێنمـدا کـە ئەبەدییـە. ئەوەتـەی هـەم هەندێـک گـەڵا لـە باغـی خۆمـدا دەبینـم کـە پاییـز دەسـتی پێیـان نـاگات، هەندێـک گـوڵ دەبینـم نامرن... منیـش تـەواو نابـم؟ نـا.. مـن دەمرم و ئـەم هـاوارەی نـاو ڕۆحمـە نامرێـت و دەڕوات و ئەبەدییـە. هاوڕێـم... گـەر شـەقامەکان تـەواو بوون ئاسـاییە ... شـەقامەکان ئەبـەدی نییـن ... ڕۆیشـتنی مـن وەک گەڕیدەیـەک ئەبەدییـە. شـارەکانیش تەواوبـن سـەیرنییە... شـارەکان ئەبـەدی نیـن... وێڵـی مـن ئەبەدییـە.

# ئاشتبوونەوە

دەمەوێت دوای شەڕێکی درێژ لەگەڵ زەویدا ئاشتببمەوە، دەمەوێت کێڵگە ماچبکەم، فرمێسکەکانم بە بای شەو بسڕم و بڵێم من چیتر غەریب نیم. دەمەوێت بڵێم ئەی دیانەتە کۆنەکان، ئەی پەرستگا ڕوخاوەکان، ئەی خۆڵەمێشی نغرۆبوون، ئەی ڕۆژی خوێنینی کوشتنی فەیلەسوفان، ئەی بای بادە، ئەی خیرقەکان، ئەی جامی سەر سفرەی مەولانا و ئەی زامی حەلاجان، دەمەوێت لەگەڵ هەمووتاندا ئاشتببمەوە... دەمەوێت سەرابتان ماچبکەم، بساوەش بە سێبەرتاندا بکەم... دەمەوێت هەستبکەم چیتر غەریب نیم... دەمەوێت لەگەڵ خۆڵ و هەوادا... لەگەڵ ئاگر و ئاودا ... لەگەڵ خالیق و مەخلوقدا یەکبگرمەوە.

دەمەوێت لەگەڵ کەشتی داگیرکەراندا بڕۆم و دوژمنەکانم بدۆزمەوە، دەمەوێت لە دوورەوە پێیانبڵێم دەمەوێت ئاشتببمەوە. دەمەوێت بڵێم ئەی بەندەرە ڕوخاوەکان، ئەی ئەو شارە غەمگین و بێ شورایانەی لە سروەی بەیانیانیش دەترسن، من هاتووم دەستبخەمە دەستی
پاسەوانەکانتان، هاتووم لەگەڵتاندا سەیری مانگ بکەم، لەسەر سفرەکانتان بیر لە خواردنی نوێ و لە داوەتی نوێ بکەمەوە.

دەمەوێت وەک با خۆم بکەم بە زیندانەکاندا، دەستبکەمە ملی دیلەکان، لێبوردن دەربکەم، سزا هەڵبگرم، مەرگ بگرمەوە. دەمەوێت جەلادەکان داوەتی ماڵی خۆمان بکەم و پێکەوە لەسەر یەک سفرە دانیشین. حەزدەکەم لەگەڵ تەیموری لەنگدا بەیانییەک بڕۆم بۆ ڕاوشکار، حەزدەکەم لەگەڵ حەجاجدا بولبول و تاوس بگۆڕمەوە، حەزدەکەم کچێک لە تەتەرە کۆنەکان بخوازم... حەزدەکەم لە سەمەرقەند خۆشبم، لەگەڵ جەنابی هۆلاکۆدا وەک هاوڕێ دانیشم، تا درەنگ شەراب هەڵدەم، تا نیوە شەو مەی بخۆمەوە.

# پچڕاندنی ملوانکەکان

شەو و ڕۆژ من ملوانکەیەک دەپچڕم و دووبارە دەیهۆنمەوە
شەو و ڕۆژ چرکەکان لە یەک دەپچڕم و دووبارە دەیانهۆنمەوە... دەیانهۆنمەوە، بەڵام بۆم نابنەوە بە ڕۆژ، بەسەعات، بە مانگ. ساڵەکان دەپچڕم و دووبارە بۆم ناهۆنرێنەوە. بۆم نابنەوە بە زەمان.

من گوڵەکان دەپچڕم و دووبارە بۆم ناکرێنەوە بە باغ
mوروی تیشکەکان دەپچڕم و بۆم نابنەوە بە ڕوناکی
وشە لە وشە دەپچڕم و بۆم نابنەوە بە کتێب
تاریکی لە تاریکی دادەبڕم و بۆم ناکرێنەوە بە شەو، باڵ وەها لە باڵ جیادەکەمەوە، بۆم نابێتەوە بە فڕین... ئەی برای غەمگینم، کە وەها بۆ mورووەکان دەگریت... مردن ئەوەیە کە ئیدی ملوانکەکانمان بۆ ناهۆنرێتەوە.

گەڵامان بۆ نادرێتەوە لە گەڵا ... حەرفمان بۆ نادرێتەوە لە حەرف ... تیشکمان بۆ نادرێتەوە لە تیشک. بەڵام دەبێت بەردەوام ئەم ملوانکەیە بپچڕین و بیهۆنینەوە، دەبێت بەردەوام ڕاستییەکان بپچڕین و بیانهۆنینەوە، خەونەکان بپچڕین و بیانهۆنینەوە، خەندەکان بپچڕین و بیانهۆنینەوە.

وەک چۆن ژیانی ئەم باڵندە گەمژانە فڕین و نیشتنەوەیە
عومری من و تۆش، پچڕانی ملوانکەکانی بوون و عەدەمی هۆنینەوەیە.

# خودا چۆن منی دروستکرد

خـودا منـی لـە پاشـماوەی گەردەلـوول دروسـتکرد، لـە پاشـماوەی تۆفـان، منـی لـە خوێنـی مـردووەکان، لـە ئێسـکی شـکاوی ئـەو جەنگاوەرانـە دروسـتکرد کـە بـە غەمگینـی لـە بیمارسـتانە ساردەکانی زسـتاندا مـردن، منـی لـە خۆڵەمێشـی ئـەو کێڵگانـە دروسـتکرد کـە مەیخانـەی مەسـتەکانی لەسـەر بـوو. لـە خوێنـاوی میـرە عاشـقەکان، لـە جامـی بـادەی کـۆن، لـە عەتـری گوڵـی مـردوو، لـە شـێتی باغەوانـەکان.

مـن لـە بۆنـی کوشـندەی ئـەم کوچـە گڵیـن و یەکسـەر و غەمگینـە دروسـتبووم، لـە فرمێسـکی دەروێشـەکان و خوێسـاری باغـە ساردەکان، لـە بەفـری ڕەش کـە زسـتانی سـپی دەبارێـت، لـە گوڵـی ڕەش کـە لـە باغـی سـپیدا دەڕوێـت.

خـودا منـی لـەو بـەردە دروسـتکرد کـە قـەڵای شـارە ڕوخاوەکانـی لێدروسـت بووبـوو.
منـی دایـە دەسـت ئـەو وەسـتایانە کـە پـێشتر مەنجەنیقیـان دروسـتدەکرد، منــی بــەخشی بەو ئاسـنگەرانە
کـە پێشـتر تەنیـا چەکوشـیان لـە زنجیـری پێـی زەندیقـەکان دابـوو، مـن دوور لـە خـۆر، وەک تینوویەکـی ئەزەلـی بـۆ هەتـاو لێـرەدا خولقـام. جەنگـم لەگـەڵ مەحشــەردا بەرپاکـرد، لەگـەڵ دەریـادا شـەڕمکرد... عەجـەب بـوو نەخنـکام.

نـا... منـی لـە غەریـزەی ئـەو دەریاوانــە پیرانـە دروسـتکرد، کـە ئەوینـی کەشـتی شێتیکردن. لـە فرمێسـکی ئـەو ماسیگرانەی تـۆڕی هەمیشـە خاڵـی سـەری لێتێکـدان.
منـی لـە هـاواری ئـەو ڕاوچییانـە دروسـتکرد کـە تیریـان هەرگیـز ناگاتـە نێچیـر.
من وەک ژەنراڵێک بووم کە بەشکستی دەوەستا تا دوژمن دەگەنە سەری.
بـەڵام دارێـک بـووم، بەوشـکیش هـەر گـەڵام دەگـرت، هـەر گوڵـم هەبـوو، هـەر میـوەم دەوەری.

## پۆستەچییەك ... هەمیشە پاییز دەهێنێت

ئەی گەڵای خیانەتکارەکان، ئەی درەختە غەمگینەکانی شار، لە مێژە پۆستەکەی من پڕە لە پاییزی ئێوە. هەر نامەیەک دەکەمەوە پڕە لە گەڵای زەرد. هەر حەرفێک دەخوێنمەوە پڕە لە بۆنی گەڵاڕێزان. ئەی درەختە بەدبەختەکان، بۆ ئێوە هەمیشە نامەم بۆ دەنوسن، دەبێت تێبگەن من ناتوانم ئێوە لەگەڵ خۆمدا ببەم. من بچوکم و دەستەکانم بچوکن و هەنگاوەکانم بچوکن. ئەی گەڵا زەردەکان، بەس هاواربکەن و بڵێن، بمانبە بەرەو دەریا، من شەو دێمە دەرێ و سەیری پۆستەکەم دەکەم و دەبینم پڕە لە گریانی ئێوە، بەیانیان بەر لە شەفەق، پۆستەکەم پڕە لە ئاونگی غەمگینی ئێوە... هەمیشە بەیانیان بەر لە شەفەق لە پەنجەرەوە دەڕوانم و پۆستەچییەکی پیر دەبینم کە پاییزم بۆ دەهێنێت. من هاواردەکەم و دەڵێم: ئەی پۆستەچی پیر، هێی ئەی پۆستەچی پیر و گومڕا، من بچوکم و دەستەکانم بچوکن و دڵم بچوکە، ئیدی ئەم هەموو پاییزە مەخەرە

پۆستەکەمەوە، ئەم هەموو گوڵە مردووە، چۆن ببەم بەرەو دەریا؟ من تەنیا بەلەمێکم هەیە بچوک، سەوڵێکم هەیە بچوک، دەریایەکم هەیە بچوک. بەڵام درەختەکان و گەڵاکان و ئەم پۆستەچییە غەمگینە گوێیان لە من نییە. من سبەی دەچم بۆ لای درەختەکان و گەڵاکان و ئەم پۆستەچییە غەمگینە و پێیاندەڵێم: من بچوکم و جانتاکەم بچوکە و مردنیشم وەکو خۆم بچوکە. گەر پاییزم زۆر پێبێت، ناهێڵن بپەڕمەوە. من تەنیا بە ئەندازەی دەستی خۆم و دڵی بچوکی خۆم دەتوانم پاییز لەگەڵ خۆمدا ببەم.

دەبێت بڕۆم و درەختەکان و گەڵاکان و وەرزەکان ببینن
نەبا تینەگەن مردووەکان لە ڕێگا پەنجەیان دەوری
نەبا نەزانن... کەسی وەک من، دەستی بچوکە، کفنی بچوکە، تابووتی بچوکە.
ناتوانێت پاییز... هەموو پاییز لەگەڵ خۆیدا بەرێ.

# تەنیا من دووبارە نابمەوە

شەوێک هەموو باڵندە کوژراوەکانی دونیا دەگەڕێنەوە
شەوێک هەموو گوڵەکانی جیهان کە مردون دێن و دەچنەوە سەر لقەکان
شەوێک هەر کۆترێکی کۆن بە سەر ئەم باغەدا فڕیوە، دێت و بەسەر باغدا دەفڕێتەوە.
هەر عەترێکی جیهان لێرەدا مردووە، زیندوودەبێتەوە، هەر هەورێکی جیهان لێرەدا باریوە، دێت و دەبارێتەوە.
من لەو شەوەدا دێم و دەمەوێت تێبپەڕمەوە
دێم و دەمەوێت دووبارەببمەوە ... لە ئاوێنەکاندا ... لەسەر پەردەکان ... لە خۆکوشتنی مەستانەدا... دەمەوێت برینەکانم دووبارەبکەمەوە، بچمەوە سەر هەمان چەقۆ، هەمان خەنجەری جاران ... بەڵام یەکێک دەڵێت: تۆ دووبارەنابیتەوە... هەموو شەپۆلەکان و ئەستێرەکان، ئەمشەو دووبارەدەبنەوە تۆ نەبیت.

ماسییەکان دەچنەوە ناو تۆڕە کۆنەکان، تەنیا من ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ لای خێڵی دێرین، هەواری کۆن، یادی شاران. من ئاوی دوێنێ، نانی دوێنێم بۆ نییە. بۆم نییە دەست بدەمەوە لە خوێنە تەڕەکەی یاران ... بۆم نییە بچمەوە بەر ئاوێنەی کۆن... ژێر شمشێری جەلاد ... بەر داری سێدارەکەی جاران. من سێوی دوێنێ و هەرمێی پێرێشم بۆ نییە ... تۆ دووبارەدەبیتەوە، گیاکان دووبارەدەبنەوە، پێغەمبەران و خوداش دووبارەدەبنەوە ... منم کە دووبارەنابمەوە ... منم چیتر بێدەروەست دەخەوم، خەبەرم لە سەرهەڵدانەوەی گوڵ و خەبەرم لە دووبارەبوونەوەی جەنگ نییە. منم کە وشەم وشە و خاشاکم خاشاک و هاوارم هاواری لە ڕەنگ نییە.

# دەمەوێت بەبێدەنگی بژیم

مـن لـە قەراغـی دەریایەکـدا دەوەسـتم و هێمنـم، دەزانـم هێمنیـم لـەو شـەپۆلە دوورانـە دەمپارێزێـت کـە بۆنـی کەشـتی خنکاویـان لێدێـت، هێمنیـم وادەکات ئـەو بەلەمانـە نەمبینـن کـە لـەدوورەوە بـۆ دوژمـن دەگەڕێـن، هێمنیـم لـە بـای ساردی شـەو دەمپارێزێـت کـە بـۆ مەسـتەکان دەگەڕێـت، لەسـەر ملـی کەنـارەکان دادەنیشـم و هێمنیـم وادەکات ئەسـتێرەکان نەمبینـن، بەخـۆم دەڵێـم «کـەس پیاوێـک نابینێـت کـە لـە قەراغـی دەریـادا بـە هێمنـی دانیشـتبێت». گەردەلوولـەکان دێـن و سـەیری هەمـوو شـتێک دەکـەن، سـەدەفی شـکاو، مـرواری شـکاو، دڵـی نەورەسـی شـکاو. بـەڵام مـن نابینـن، مـن بەجۆرێـک هێمنـم، کەنـاری دەریـا نازانێـت مـن لەوێـم، بـا نازانێـت، هەتـا یـەک دڵـۆپ ئـاوی بچکۆلانـەش نازانێـت، مـن لەوێـم. مـن کەسێکم

کەنـار و کەشتـییـەکان دەتوانـن لەبیـرمبکەن... هـەموو کـەسێک، هەمـوو شـتـێک، دەتـوانێت لەبـیرمبکـات... مـن لـەسەر ئەو لێوارە دەوەسـتم و دەزانـم، دەریـا نازانێـت، یـەکێک تەماشـایدەکات، کەشتـییەکان تەقـە لـە یەکـتر دەکـەن و نازانـن مـن دەیانبینـم، مـن بەجۆرێـک هێمنـم گوێـم لەدەنگـی خەیاڵـی ماسـیگرەکانە، گوێـم لەدەنگـی تۆڕەکانـە کـە ئەمشـەو بـەر ئـاو دەکـەون، گوێـم لـە هێلکـەی ماسـییەکانە کـە دەتروکێـن... گـەر دەتەوێـت وەک مـن گوێـت لـە دەنگـی خنـکاوەکان بێـت لـە ژێـر ئـاودا پێدەکەنـن، گـەر دەتەوێـت ئاسـمان نەتدۆزێتـەوە، دەبێـت وەکـو مـن هێمـن بیـت. وەرە سـەیرمکە... مـن بەچەشـنێک هێمنـم ڕوناکـی نامبینێـت... بـە جۆرێـک هێمنـم ئەسـتێرە نامدۆزێتـەوە...

# دەریاچەی ون

چەند ڕۆژە من و ئەم قافڵەیە بۆ دەریاچەیەک دەگەڕێین...

دەریاچەیەک جاران لێرەدابوو.

بەر لە ئێمەش ئەم باڵندە سەیرانە هاتوون و بۆ ئەو دەریاچە ونە دەگەڕێن ...

دەریاچەیەکە... مرۆڤ مانگە نەبینراوەکان لە بنیدا دەبینێت، میوەی تێدایە لە هیچ وەرزێکدا نەبینراوە، ئەستێرەی ڕاکردوو و نەیزەکی بە خوێناوی سبەی سوور، فریشتەی خنکاو بە باڵە تەڕەکانیانەوە.

ئێمە لێرەدا هۆردوو دەخەین ... بە خۆمان و قیبلەنما و پێوەرە کۆنەکانمانەوە، بۆ دەریاچەیەک دەگەڕێین کە دەڵێن ڕۆژێک لێرەدا بووە. ئێسک و پروسکی ئەو قافڵانە دەبینین کە لێرەوە ڕۆیشتن و وەک ئێمە بۆ دەریاچە دەگەڕان. ئیمامی غەمگینی پەلامارەکەمان دەڵێت: تاریکییەک لەگەڵ شیری دایکماندا خواردوومانە، ناهێڵێت ببینین، پێکێک بە منداڵی هەڵمانداوە ناهێڵێت بیدۆزینەوە. من و ئەم قافڵەیە بەردەوام بەدەوری ئەم تاریکییەدا دەسوڕێینەوە، ئیمامە غەمگینەکەمان دەچێتە سەر بەردێک و وەک هاوار لە خودا بکات دەڵێت : ئەی دەریاچەی ون تۆ لە کوێیت؟. هەمیشە لە جێگایەکی ونەوە، دەریاچە وەڵامماندەداتەوە : من لێرەم... من لێرەم... هەمیشە و هەمیشەش لێرەدەبم. ئێمە دوای دەنگی ئەو دەکەوین و نازانین لە کێوە دێت. ئیمامە غەمگینەکەمان دەڵێت : ئەوە دەنگی سەرابێکە لەگەڵ شیری دایکماندا خواردوومانە بانگماندەکات. بەڵام ئێمە کوێرنین، ئێمە لێرەدا دەوەستین و بۆنی دەریاچەیەک دەکەین کە لە ژێر پێی ئەسپەکانماندا خەوتووە ... دەریاچەیەک هێدی هێدی، چۆن مرۆڤ هەنسکی خۆی دەخواتەوە، زەوی خستوێتییەوە نێو دڵی خۆی... دەریاچەیەک، تەنیا دەلیلی بوونی ئێمەین کە بەدوایدا دەگەڕێین... تەنیا دەلیلی مردنی ئێمەین کە مردوین و بێئەوەی بزانین لە ناویدا دەگەڕێین.

# چیرۆکی ئەمیرێکی دیل

کوشکێکی دووری سپییە، لە ئێوارە تاریکەکاندا، قەڵەندەرەکان دەیبینن. بەر پەنجەرەکانی پڕن لە فریشتەی خەوتوو، سەربورجەکانی پڕن لە باڵندەی شینی گەورە کە تەنیا بەیانیانی غەم دەفڕن. لەسەر کورسییەکانی پیاوانێک لە تەم کە هەرگیز ناجوڵێن و ناڕەوێنەوە دانیشتوون. خانمانێک لە جلی ئاوریشمدا، ئەوەتەی هەن لە بەر ئاوێنەکانیدا وەستاون. خزمەتکارانی ڕەشپۆش بە خۆیان و سینی پڕ گیلاسەوە لە مێژە لە ڕاڕەوەکاندا بێهودە دێن و دەڕۆن. کۆشکێکە شەونمی گەمارۆیەکی نادیار لەسەر پەنجەرەکانی نیشتووە، بۆنی کوشتارێکی کۆن لە پایە و ستوونەکانی دێت. هەموو ڕۆژێک، ئەمیرێکی لاواز، لە پۆستاڵە سپییە کۆنەکانیدا، لە باڵکۆنەکانیدا دەوەستێت، بە ئاوێنە لەگەڵ قەڵایەکی دووردا قسەدەکات، لەگەڵ ژنێکی غەمگیندا کە لەدوورەوە بە شفرەی «با» نامەی بۆ دەنوسێت. ئەمیرێکی لاواز کە هەموو بەیانییەک

بەر لە بەرچایی، ئاورنگی سەر گوڵەکان دەخوێنێتەوە، حەرف حەرف شنەی با وەردەگێڕێت، شەوان بۆنەوەی کوێرنەبێت، سەرقاڵی تەرجومەکردنی تیشکە. بە خۆی و پۆستاڵە سپییەکەیەوە، لە ناو ئەم کتێبخانە خوێناوییەدا وندەبێت، لە ڕیواقی ئەو کتێبانەدا کە پڕە لە بۆنی خوێنەری کوژراو، ئەو کتێبانە هەڵدەداتەوە کە پڕن لە وەسفی گوڵی کوێر ... لە پەڕی مەلی سەربڕاو. ئەمیرێکە ئێواران بە خۆی و کتێبێکەوە لە بالکۆنەکاندا دەوەستێت، مەودای نێوان خۆی و تیشکەکان دەپێوێت، مەودای نێوان، خۆی و ژنێکی دوور پێوانەدەکات، مەودای نێوان خۆی و ئەو کەشتیانەی لە خەوندا دەیانبینێت. هەموو شەوێک نائومێد لەو کتێبخانە تاریکە دێتەدەرێ، کە هەزاران بەرگی تێدایە، دەربارەی نەگەیشتن بە سوبح و نەگەیشتن بە دەریا. هەزاران کتێب لەسەر کۆشکی ون و دەرگای بێ کلیل و جۆری کوێرە ڕێگا. کتێبی گەورە گەورە... لەسەر ئەو کوشکانەی کە هەرگیز ناکرێنەوە، ئەو کۆشکانەی وندەبن و کەس نایاندۆزێتەوە، ئەو کوشکانەی

هەزاران ساڵ دەسووتێن و ناکوژێنەوە، هەموو شەوێک نائومێد، بە پۆستاڵێکی سپییەوە بە سەر ژنە تەنیاکانی کۆشکدا دەگەڕێت، سەیری جوانی ئەبەدییان دەکات کە تەنیا ئاوێنەکان دەیبینن، لە گێلاسی ڕەشی خزمەتکارەکان دەخوات کە بەجلی سوورەوە لە پێڕەوەکاندا دێن و دەچن، سەیری هەناری وەریوی ئەو داوەتانەدەکات، کە هەرگیز داوەتکراوەکانی ناگەنە ئێرە. دیسانەوە دووری نێوان خۆی و ئەو بورجانە دەپێوێت کە خۆریان لێئاوانابێت. بە ئاوێنە دڵداری لەگەڵ ژنێکدا دەکات لە کۆشکێکی دیکە و لە زەمانێکی دیکەدا ... کەسیان ناتوانێت لەقەفەزی خۆی دەرچێت... کەسیان ناتوانێت بزانێت لە کوێی زەمان و لە کوێی گەردوندا وەستاوە... هەموو ڕۆژێک بە پۆستاڵێکی سپییەوە لە باڵکۆنەکانەوە سەیری ڕێگایەک دەکات کە نازانێت دەچێت بۆ کوێ... سەیری ئاوێک دەکات کە نازانێت لە کوێوە دێت... چاوەڕوانی هەورێکە کە ناڕوات، چاوەڕوانی بایەکە هەڵناکات ... چاوەڕوانی وەڵامێکە کە نایەت... چاوەڕوانی کلیلێکە کە ناگات.

# ئەی پشکۆی من

هەمیشە دەسووتێیت و دەسووتێیت... ئەی پشکۆی من.
لە مێژە ئاگردان کوژاوەتەوە، لە مێژە ڕاوکەرەکان لە ڕەشماڵەکانیاندا خەوتوون.
لە مێژە باران دەبارێت... بەڵام تۆ هەمیشە دەسووتێیت. باڵندەکان دێن و دەفڕن و لە تاریکیدا پیردەبن. شەونم کە دوێنێ لە دایک بووە، ئەمڕۆ دەمرێت. گیا کە چەند هەفتەیەکە هاتووە ئەمشەو دەڕوات و ناگەڕێتەوە...
هەموو مەخلوقێک کاتژمێری خۆی پێیە... تۆ نەبێت... تۆ نەبێت... ئەی پشکۆی من.

ئەو ڕێبوارەی هەمیشە دەڕوات و ناخەوێت... هات و لێرەوە تێپەڕی.
ئەو هەورەی هەموو ڕۆژێک دێت و سەیرماندەکات و نابارێت... هات و ڕاگوزەر

لە بازاڕی ئاسنگەران کورەکانیان خامۆشکرد. لە مەزاتخانەکان مەزاتی ژیان وەستا، نانەواکان تەنووریان کوژاندەوە و هەموو نانێک فرۆشرا، زەوی پڕبوو لە خۆڵەمێشی ئەو ئاگرانەی بای زەمان بەسەریاندا هەڵیکرد... هەموو مەخلوقێک تەمەنی خۆی دەزانێت... تۆ نەبێت... تۆ نەبێت... ئەی پشکۆی من.

ئەوانەی حیسابی باج بۆ پادشاکان دەکەن، فوویان لە مۆمەکان کرد. شاعیرەکان چراکانیان خامۆشکرد و لە باغدا لێیخەوتن. دەریا کەشتی و کەشتیەوانەکانی خەواند... دونیا هەمووی تاریکە... تاریک ... ئەو ئاگرەی قەتارچییەکان خۆشیانکرد، کوژایەوە. ئەو شارانەی خۆیان سووتان، خۆڵەمێشەکەشیان بابردی.
هەموو شتێک دەڕوات... هەموو شتێک دەکوژێتەوە...
تەنیا تۆیت هەمیشە دەسووتێیت... تۆیت... ئەی پشکۆی من.

هەموو کتێبی دونیا دەخەینە سەریەک و گڕی تێبەردەدەین. ئەرشیفی هەموو دەریا دەخەینە ئاگرەوە. هەموو سێوێک، هەموو هەرمێیەک، هەموو دەنکە ترێیەک دادەگیرسێنین... هەمووی دەسووتێت و دەبێتە خاشاک و خامۆشدەبێت.
تەنیا تۆیت نابێتە خۆڵەمێش و ناکوژێیتەوە... تۆیت... ئەی پشکۆی من.

# ڕەشترین شیعری دونیا

پەنجەرەیەکم هەیە لەسەر دیوارێکی نهێنییە. دیوارێک لە پشتییەوە حەوشێکی ڕەش هەیە، لەوێدا هەندێ بولبول لە قەفەزی ڕەشدا گۆرانی دەڵێن. من زۆربەی ژیانم لەبەر ئەو پەنجەرە نهێنییەدا دەبەمەسەر، پەنجەرەیەکە دەتوانم لەگەڵ خۆمدا بیگێڕم، هەر کاتێک هەموو شتەکان تاریک دەبن، من ئەو پەنجەرەیە دەکەمەوە و گوێ لە بولبولی ڕەش دەگرم، کە گۆرانی ڕەشم بۆ دەڵێن.

پەنجەرەیەکم هەیە لەسەر دیوارێکی ڕەشە، لە پشتییەوە ئاسمانێکی ڕەش هەیە، لەوێدا هەندێ فریشتەی ڕەش هەیە، کە فەرشی ڕەش دەچنن، کفنی ڕەش دروستدەکەن... من زۆربەی ژیانم تەماشای ئەو فریشتانەدەکەم، کە خەندەی ڕەشم تێدەگرن، سڵاوی ڕەشم لێدەکەن.

مـن ئـەو پەنجـەرە نهێنییـە لەگـەڵ خۆمـدا دەگێـڕم. کـە هەمووتـان دەخـەون، ئـەو پەنجەرەیـە دەکەمـەوە، بۆنـی ئەسـتێرەی ڕەش دەکـەم، مانگـی رەش کـە تەنیـا مـن دەیبینـم، لـە تێشـووی ڕەش دەخـۆم کـە لـە ڕێبـواری نائـومێد جێدەمێنێـت، کتێـبی ڕەش دەخوێنمـەوە کـە دەسـتی ڕەش دەینوسـێت، مزگەوتـی ڕەش کـە بانگـی ڕەشـی تیادەدرێـت، میـوەی ڕەش کـە دوای ڕۆژووی ڕەش دەخورێـت.

مـن پەنجەرەیەکـم هەیـە، لەسـەر دیوارێکـی نهێنییـە. لەودیوییـەوە شـارێکی ڕەش هەیـە، لـەو شـارەدا شـەقامێک هەیـە، لەو شـەقامەدا ئێـواران هـەزاران کچـی غەمگین نامـەی ڕەش دەنوسـن. مـن هەمـوو شـەوێک دەچـم ئـەو نامانـە دەخوێنمـەوە. کـە دێمـەوە پـڕم لـە ئیشراقاتـی ڕەش، لـە بەهارانـی ڕەش، لـە لالەزارانـی ڕەش.

پەنجەرەیەکـم هەیـە، لەسـەر دیوارێکـی نهێنییـە کـە تەنیـا مـن دەیبینـم. دیوارێکـە لـە ژوورێکـی ڕەشـدایە، تەنیـا لـە ڕۆژی ڕەشـدا دەبینرێـت، تەنیـا لـە سـەعاتی ڕەشـدا دەکرێتـەوە، تەنیـا یەکێکیـش تێیدەچێـت کـە وەکـو مـن هەمـوو نیـگای لـە یەکـەم ڕۆژەوە تـا قیامـەت، پڕبێـت لـە نیـگاری ڕەش.

# پیاوێك كە گوڵی خۆش ناوێت

ئـەو گوڵـی خـۆش ناوێـت، گـوڵ ئـەو ژیانـەی بیردەخاتـەوە کـە زوو دێـت و زوو دەڕوات.

گـوڵ دەریـای بیردەخاتـەوە کـە زۆر دووره... بەهەشـتی بیردەخاتـەوە کـە نایگاتـێ... نـا ... نـا... ئـەو گوڵـی خـۆش ناوێـت. گـوڵ ئەسـتێرەی بیردەخاتـەوە کـە زۆر بـەرزە، ئـەو شـارانەی بیردەخاتـەوە کـە نایانبینێـت، پاییـزی بیردەخاتـەوە کـە لـە ترسـی گـوڵ دەلەرزێـت. نـا... نـا... ئـەو گوڵـی خـۆش ناوێـت. گـوڵ خۆڵەمێشـی ئـەو شـارانەی بیردەخاتـەوە کـە جارێکـی دی گەڵایـان تیـا سـەوزنابێت. ئـەو باغەوانـەی بیردەخاتەوە کـە بـاغ لـە یادیکـردوە ... ئـەو هەتـا باغیشـی خـۆش ناوێـت ... بـاغ دواهەمیـن سـنووری جوانـی بیردەخاتـەوە ... بـاغ شـتێکە لـە نزیـک عەدەمـەوە دەڕوێـت ... لـە هـەر شـوێنێک بـاغ هەبێـت، مـردن تەماشـایدەکات، عـەدەم بەرامبـەری دەوەسـتێت و پێدەکەنێـت.

# حەمامی شاژنان

هەموو ڕۆژێک هەمان هەڵم کە لە هەمان حەوزی زێڕین هەڵدەستێت.
هەمان شاژنی ڕووت بەخۆی و کەنیزەکە ڕووتەکانییەوە لەبەر هەمان دوشی زێڕیندا دەوەستێت. هەمان کەفی سپی بەسەر هەمان تەنهاییدا دێتەخوارێ، هەمان مێردمنداڵی خەسیو بە هەمان شاڵی ئاوریشمەوە، سەیری هەمان جەستەی دووبارەدەکاتەوە. هەموو شتێک لێرەدا دەوەستێت، با لێرەدا ناڕوات، بولبولەکان ناگەنە ئێرە، گوڵ ناگاتە ئەم باغە، تەنیا سوارچاکانی خەون دەگەنە ئێرە کە بەسەر ئەسپە غەمگینەکانیانەوە لە تەمدا دەردەکەون. ئەو پیاوانەی خەیاڵی ئەم ژنە بێکەسانە لێرەدا دروستیاندەکات، ئەو شاعیرانەی شاژن لە خەونیدا خۆی دەخاتە بەردەستیان، ئەو نەقاشانەی لەسەر پشتی ئەو گوڵی ئەفسانەیی دەچنن، لەسەر مەمکی بازنەی ئەفسانەیی دەکێشن، لەسەر لەشی لاکێشەی زێڕین و سێگۆشەی سیحراوی دروستدەکەن.

هەر پیاوێک بێتە ناو ئەم غوبارەوە کوێردەبێت، هەفتانە وەستایەکی کوێر لێرەدا فوارە دروستدەکات، ئەو بۆی هەیە بە ناو ئەم هەڵمەدا بڕوات، ئەو بۆی هەیە غوباری ئەو لەشانە هەڵمژێت، شێی ڕووتی کە لە شێی هیچ باغێک و هیچ دەریاچەیەک ناچێت. هەفتانە لێرەدا بەخۆی و کرێکارە نابیناکانییەوە بەرد بە بەرد لە دوورەوە دەیهێنن، گوێیان لە هیچ دەنگێک نییە، بەڵام دڵنیان لە نزیکییانەوە غوبار پڕێتی لە ڕووتی ڕەها و بێکەران... بەخەیاڵی ئەو هەموو لەشانە خشت دوای خشت، بازنە دوای بازنە لەسەر ئەم ئەردە دایدەنێن... لەوێ لەو هاڵاوە گەرمەدا، بۆنێک هەڵدەمژن لە هیچ باغێکدا نییە و لە هیچ ژنێکی ڕاستەقینە هەڵناستێت، بۆنی ئەو شاژنانەیە لە تەمدا بە ڕووتی ئاو بە گوناهەکانیاندا دەکەن، ئەو کەنیزەکانەی ئارەزووەکانیان دەشۆن و لەسەر تەنافێکی نهێنی هەڵیدەخەن... چەندین ساڵە فوارە لەدوای فوارە لێرەدا دروستیدەکەن ... بەڵام ... ئەو شاژن و کەنیزەکانە تەنیا لە خەیاڵی ئەواندا هەن... بەڵام ... ئەم کرێکارە ڕووتانە تەنیا لە خەیاڵی شاژن و کچەکاندا هەن... ئێمە دێین و بە کوێری دەبینین... ئەوەی هەیە و نییە ئەم فوارانەیە... ئەم هاڵاوە زۆرەیە کە شەڵاڵە بە بۆی ئارەزووەکان ...

ئێمە دێین و دەزانین...

هەر پیاوێک بە ڕاستی لێرەدا چاوبکاتەوە
تادەمرێت لە حەسرەت ئەو دیدە شێت دەبێت
هەر ژنێک لێرەدا بگات بە ویساڵ
تادەمرێت لە خۆشی ئەو ساتە مەست دەبێت.

# لە ژوورێکی بێدەنگدا

ئەم ژوورە هێندە بێدەنگە، گوێم لە دەنگی باڵندەکانی ناو سەرمە دەفڕن
گوێم لە پاشماوەی شەوە کە لە باغ ڕایکردوە و لێرەدا نوستووە
گوێم لە کتێبەکانە لە خەو هەڵدەستن و یەکتری بانگدەکەن
گوێم لە پەیکەرەکانە تەپوتۆزی دێرینی یەک دەخوێننەوە
«پەیکەرەکان تەنیا دەتوانن تۆز بخوێننەوە»

من گوێم لە دەنگی کتێبەکانە یەکتری دەخوێننەوە
گوێم لە لێدانی دڵی بولبولە شوشەکانە... گوێم لە چرپەی گوڵدانەکانە.
گوێم لە گوڵی نایلۆنە چۆن بیر لە باغ دەکاتەوە
گوێم لە دەنگی مۆمەکانە فوو لە تیشکی یەک دەکەن
گوێم لە قەوانەکانە، ستایشی ئاوازی یەک دەکەن

لە وێنەکانی جارانە ستایشی ڕوناکی دوێنی دەکەن
گوێم لە مراوییە کوژراوەکانە، ستایشی تاپڕی کۆن دەکەن
هەمووومان لێرەدا جگە لە تیشکی کۆن، جگە لە تۆزی کۆن هیچی دیکەمان نییە
من گوێم لێیە سەعاتەکان باسی سەعاتچی مردوو و جوانی زەمانی کۆن دەکەن.
گوێم لێیە پەیکەرەکان باسی پەیکەرتاشی کۆن و حیکمەتی چەکوشی کۆن دەکەن.

# ئەوە شوێنی تۆیە دەگری

دەستت بەر هەر شتێک کەوتبێت... ئێستا دەگری
گەر دەستت بەر ئەم سەعاتە کەوتووە ...
ئێستا دەیەوێت بەبێ تۆ ... زەمان حیساب نەکات.
گەر دەستت بەر ئەم چەترە کەوتووە... ئێستا دەیەوێت بەبێ تۆ... کەس بۆ ژێر بارانی نەبات.
گەر دەستت بەر ئەم پەرداخە کەوتووە... ئێستا دەیەوێت بەبێ تۆ... کەس شەرابی تێنەکات.
گەر دەستت بەر ئەم شەرابە کەوتووە... ئێستا دەیەوێت بەبێ تۆ... کەس نەیخواتەوە
گەر ئەم قومارەت کردوە... ئێستا دەیەوێت بەبێ تۆ... کەس نەیکات ... کەس نەیباتەوە
گەر دەستت بەر ئەم کتێبە کەوتووە ... ئێستا دەیەوێت بەبێ تۆ... کەس نەیخوێنێتەوە.
نا هاوڕێم ... نا... کەس نییە تۆی دیبێت و تۆی لە بیرچووبێتەوە.

ئێمە دەچینە بەر قاپی باغەکان و بەبێ تۆ کەس کلیلی گوڵمان ناداتێ
دەمانەوێت مەست بین، دەچینە بەر دەرگای ساقی... بەبێ تۆ شەرابمان ناداتێ
لەسەر کەشتییەکان... بەبێ تۆ ... نەیانهێشت سەیری دەریابکەین
لەم شاری شوشەیەدا ... بەبێ تۆ... نەیانهێشت سەیری گوڵە شوشەکان بکەین
ئەوە سێبەری تۆیە هاوڕێم... هات و لێرەوە تێپەڕی
ئەوە شوێن دەستەکانی تۆیە هاوڕێم ... لێرە دەگری

# پەردە

تەنیا ئەکتەرەکان لەودیو پەردەوە نین... خۆریش لەودیو پەردەوەیە، دەریاش لەودیو پەردەوەیە. هیچ شتێک بەڕاستی ناگاتە من، تیشک لەو دیو پەردەوەیە و باغ و باڵندەکان هەر لەودیو پەردەوەن. ئەو مامۆستایەی وەستاوە یاساکانی دونیام فێربکات، ئەو دەرهێنەرەی دەیەوێت پێمبڵێت، بۆ من چ نمایشێک باشە ... هەموو دوورن ... هەموو لەودیو پەردەوەن. ئەو درەختانەی وانەم لەسەر ئەفسوونی پاییز پێدەڵێن. ئەو عەتارانەی فێرمدەکەن، چۆن مەرهەمی ڕۆژ لە زامی شەوم بەم... ئەو فریشتەیەی دەیەوێت سنووری نیوان زیندەگی و مەرگم نیشانبدات، ئەو دەستەی دەیەوێت لەم خەرەندە سەرمبخات، ئەو ئاسنگەرەی دەیەوێت ئەم زیندانە بشکێنێت و بەرمدات. هەموو دوورن... هەموو لەودیو پەردەوەن. هەتا وشەکانیش دوورن و نایانگەمێ.

تەنیا، تەنهایی لەمدیوی پەردەیە، تەنیا تەنهایی... ئیدی هەموو جیهان... دایکم و دەریا ... کچەکەم و ئەستێرەکان ... ژنەکەم و ئینجانە غەمگینەکانی ... هاوڕێکانم و خیانەت ... هەموو دوورن ... هەموو دوورن ... هەموو لەودیو پەردەوەن.

# خیانەت

شەو بەجێیهێشتین.
جلە خوێناوییەکانی خۆی لێرەدا دانا و ڕۆیشت. شمشێری جەنگەکانی دوێنێ و خەنجەری بە خوێنی دوژمنان سوور. کفنی بۆ دانایین کە گوڵاوی دۆزەخی پێوەبوو، زنجیر کە لە مێژە لە یادی ئێمەدا زرینگەی دێت ... هەموو شتێکی جێهێشت و لە تاریکیدا ونبوو. خیانەتی لە هەموو شتێک کرد... لە ساڕێژکردنی برین بە سووتووی گوڵ، لە گرتنەوەی خوێن بە دەرمانی شاعیران، لە بەستنی ئێسک بە مەرهەمی خەیاڵ.

تۆی بەجێهێشت کە تا ئێستا پێویستت بە شیری نومێدە. پێویستیت بەدەستێکە لەگەڵ بای شەودا بەرتبات، پێویستیت بە زنجیرێکە کە دەستی تۆ بەدەستی دەریاوە ببەستێت. تۆی بەجێهێشت کە دەتەوێت پەتێک لەگەڵ ئەستێرەدا گرێتبدات. ئەو تەنیا کەسێک بوو کە دوژمنی دەناسی، ئیتر چۆن دەتوانین بەبێ ئەو پەیمان لەگەڵ ڕەقیبدا بنوسین، چۆن بەبێ ئەو لەگەڵ تەتەرە برسییەکاندا ڕووبکەینە ئێوارانی بەهار.

ئـەو کوچەکانیشـی بەجێهێشـت کـە پێویسـتیان بـە یەکێـک بـوو، زنجیـر لـە قاچـی کۆیلەکانـدا بشـکێنێت. پێویسـتیان بـە ئاسـنگەرێک بـوو، قفڵـی زێڕینیـان بـۆ بـکات. بولبولەکانـی کوچـە پێویسـتیان بـە نیـگای ئەوبـوو تـا غـەم نەیانکوژێـت، منداڵـەکان پێویسـتیان بـە کۆلارەکانـی ئـەو بـوو، ژیانیـان بۆسـەربخات. وەک ئەفسـەرێکی پیـر بـە نـاو خەزانـدا دەڕۆیشـت و لەگـەڵ بـادا شـەڕیدەکرد.

ئەو تەنیا جەنگاوەری ئێمە بوو، دەیتوانی لەگەڵ بادا شەڕبکات.

کاتێـک گوردانەکانمـان پێویسـتیان بـەو بـوو، تـا بـەرەو پێـش پەلاماربـدەن. کاتێـک گوللـە تۆپەکانمـان بەبـێ ئـەو نەدەگەیشـتنە کەنـاری دوژمنـان، کاتێـک تفەنگەکانمـان بەبـێ ئـەو ئومێدیـان بـە ئێمـە نەبـوو، ئـەو شـەوێک لـە سـەنگەرە پـڕ خوێنەکـەی خـۆی هەسـتا و ڕۆیشـت و بەجێیهێشـتین.

کە ڕۆیشت هەر کۆترێک لە کوچەدا بە ئاگابوو لەگەڵیدا ڕۆیشت. سەرشانی هەمووی شەوەمی باغی ئێمە بوو، هەموو کتێبە گەورەکان و پەیکەرە قەشەنگەکانمان دوای کەوتن. کاتێک تێگەیشتین کە ئەو خیانەتیکردوە، کتێبخانەکانمان خاڵی و باغچەمان خاڵی و سەنگەرەکانمان خاڵی بوون. کاتێک تێگەیشتین، دوژمن لە بەردەرگا و مردن بەرامبەرمان بوو. نەیاران و جەنگاوەرە شێتەکانیان لەو دیو شوراکانەوە سەیریاندەکردین. هەموو دەمانزانی تۆپخانەکانمان خاڵییە، قەڵغانەکانمان بەبێ ئەو هیچ شمشێرێک ناگێڕێتەوە... سەرەتا وامان دەزانی مردووە ... تا لە خۆڵەمێشی خۆماندا نوقم نەبووین ... تا لە سوتووی خۆماندا نەخنکاین ... باوەڕمان نەکرد کە ئەو بەجێیهێشتووین... باوەڕمان نەکرد کە ئەو خیانەتی کردوە.

# لە سەدە تاریکەکاندا، شەو درێژتر بوو

لەسەدە تاریکەکانـدا کـە شـەو درێژتـر بـوو، دەنگـی بولبولـەکان تا دەرگای ئەسـتانە دەڕۆیشـت. گوڵـی سـەر مافـوورەکان بۆنیـان لـە گوڵـی باغـەکان خۆشـتربوو، ئـەو ئاگرانـەی لـە شـاران بەردەبـوون خاشـاکی زۆرتریـان جێدەهێشـت، بـا توندتـر زەنگەکانـی ڕادەوەشـاند... شـەهوەت لـە گـەرداو شـێتتر و لـە ئاگـر بەهێزتربـوو، ژنـان لەبـری خـەراج ماچیـان بەسـوڵتانەکان دەدا، مەمـک دڕتـر و غەریـزە شـێتتربوو. ئاوێنەفرۆشـەکان وەک سـیحرباز بـە کیسـەی پـڕ زێـڕەوە لـە شـارەکاندا دەردەکەوتـن، ئەمیـرەکان بـۆ سـەیری خۆیـان زەوی و زاریـان دەفرۆشـت، کچـان کچێتیـان دادەنـا، زەمانێـک بـوو ژنـان لـە پشـتەوە دۆسـتیان دەبـردە سـەر جێـگا، یاریکـردن بـە غەریـزەکان نـوێ و خیانـەت خۆشـتربوو، زەمانێکـی تربـوو... لەسـەدە تاریکەکانـدا شـەو درێژتـر بـوو.

ا

لەسەدە تاریکەکاندا، دەریا وەها نزیک نەبوو، کەنار دوورتربوو. گوڵفرۆشان بە کاروانی گەورە خۆیاندەکرد بە شارە خەوتووەکاندا. باغ گەورەتر و مردن بە چێژتربوو. دەنگی بازرگانەکان زوڵاڵ بوو، دەیانزانی چۆن وەسفی ئاوریشمی چین و گوڵاوی کشمیر و مافووری کاشان دەکەن، گەڕاڵەکان دەیانزانی چۆن بەدەریادا دەڕۆن، دەگەنە ئەوسەری زەمین، بۆنی شاران دەکەن. لەسەدە تاریکەکاندا نیشتیمان گەورە و زەوی گەورە و ئاسمان دوور بوو. ئەو ژنانەی خڕخاڵیان لە پێدابوو، لە شوێنی حەریمدا بە شیفۆنی سپییەوە سەمایاندەکرد، عەشق هەمیشە گەنج و شەڕ هەمیشە گەنج و تەنیا عەدەم پیربوو. سەری دوژمنەکان لەسەر سینی هەتا ئەستانە دەڕۆی. شورا وەها بەهێزبوو بەرگەی پەلاماری سوپا دڕندەکانی دەگرت، سوارچاکان بەدوای گوڵی ئەفسانەییدا تا ئاوی ئاموون دەڕۆیشتن، لەسەدە تاریکەکاندا بەحر کەشتییەکانی خۆی و زەوی ڕێبوارەکانی خۆی لەبیربوو. داهۆڵ لە کێڵگەکاندا زیاتر شەڕیان لەگەڵ باڵندەدا دەکرد، شەڕکەران زیاتر حەزیان لە خوێن و برین بوو. لەسەدە تاریکەکاندا ... وەهابوو ... ئاسمان بەرزتر و زەوی نەویتر بوو... خوا بەڕەحمتر و شەیتان بەهێزتربوو.... لە نێوان مۆم و پەروانەدا سووتان پەیمان بوو، لە نێوان مەستی و ئیماندا مەستی لە پێشتر بوو. لەسەدە تاریکەکاندا وەهابوو... ماچ درێژتر بوو.

١

# ئەو پیاوەی کتێبەکانی دەکوژاندەوە

کـە ئاگـر لـە کتێبخانـەکان بەربـوو، کۆترەکانمـان هەمـوو فڕیـن... هەمـوو لـە مێـژە دەزانیـن، هیـچ شـتێک وەک خۆڵەمێشـی وشـە کۆتـر ناخنکێنێـت. هەمـوو شـار لێـرەدا بەبێدەنـگ سـەیری وشـەکانمان دەکـرد بـە ئاگـرەوە ڕادەکـەن. هیچ کەسێک ئـاوی نەکـرد بـەم ڕسـتانەدا کـە وەک پشـکۆ دەسـووتان، کـەس بڵێسـەی حەرفێکـی نەکوژانـەوە، هەمـوو سـەیری یەکـمان دەکـرد، هەمـوو لـە ترسـی ئـەو کتێبـە ئاگرینانـەی بڵێسـەیان دەگاتـە مەلەکـوت، لـەم شـارە ڕامانکـرد... دەمانزانـی ئـەم ئاگـرە هەرگیـز خامـۆش نابێـت... دەمانزانـی ئـەم حەرفانـە کـە یەکجـار گڕیـان گـرت ئیـتر تـا قیامـەت ناکوژێنـەوە

مـن گووتـم : ئـەی ئەوانـەی ئاگـر دەكوژێننـەوە، بێهـودە خۆتـان دەكـەن بـەم كتێبخانەیـەدا، گـڕی كتێـب تەنیـا بـە ئـاوی دەریایـەك دەكوژێتـەوە، شـاعیران دروسـتیانكردبێت.

كـە ئاگر لـە كتێبخانـەكان بەربـوو، درەختەكانمان هەمـوو گریـان... هەمـوو دەمانزانی، هیـچ شـتێك وەك خۆڵەمێشـی وشـە بـاغ ناسـووتێنێت. ئـەو ئاگـرەی لـە وشـەكان بەردەبێـت، درەنگـتر لـەو ئاگـرە دەكوژێتـەوە كـە لـە شـارەكان بەردەبێـت. تـا ئـەم كتێبخانەیـە نەسـووتا نەمانزانـی چ ئاگرێكـی نهێنـی لـە نـاو لاپەڕەكانـدا خەوتـووە، لـە نـاو هەمـوو كتێبێكـدا دەیـان جەنگـەڵ هەیـە كـە هەرگیـز ناكوژێنـەوە، دەیـان شـار، دەیـان دەریـا، هـەزاران باڵنـدە كـە گڕیـان گـرت تـا مەلەكـوت بـە ئاگـرەوە دەفـڕن.

مـن گووتـم: بـرادەر... ئاگـری ئـەم دونیایـە تەنیـا بـە خوێنێـك دەكوژێتـەوە، لـە برینـی شـاعیرانەوە هاتبێت.

هەموو بینیمان بە خۆی و دەستە خاڵییەکانییەوە، چووە ناو ئاگر.

گووتی : من پڕم لە پەرەگرافی ڕەش، پڕم لە فەهرەستی سووتاو. گووتی: لە منداڵییەوە پڕم لەو ڕستانەی لەسەرمدا ئاگردەگرن، پڕم لە کتێب کە لەسەر ڕەفە بەرزەکانی ڕۆحمدا دەسووتێن و نایەنەخوار. بە خۆی و خەندەیەکی غەمگینەوە چووە ناو کتێبەکان، بە ئاوێک لە ڕووباری تەنهایی خۆیەوە هاتبوو، بەدەستێک کە کڵپەی وشەکانی خامۆشدەکرد ... سووتوەکانی کردەوە بە وشە... بڵێسەکانی کردەوە بە ڕستە ... خۆڵەمێشەکانی هەڵگرت و لەدەستیدا بوونەوە بە نوسراو. هێدی هێدی بە ناو ئاگردا تێپەڕی... هێدی هێدی لە چاوانم ونبوو... ئیدی نەسێبەریم بینی و نە ئاسەوار. بەڵام دەزانم هەر کتێبخانەیەک دەسووتێت، ئەو لەوێ بە ئاوێک لەدەریای ئومێدەکانی خۆی هێناوێتی، وشە لەدوای وشە و پەرە لەدوای پەرە دایاندەمرکێنێتەوە.

ئەو شاعیرێکی گەورەیە ...

ئەو کتێب نانوسێت، ئەو کتێب دەکوژێنێتەوە ...

برادەر، هەموو قەرزاری ئەوین... هەموو قەرزاری ئەو

ئەوەی هاواری دڵ دەنوسێ و ئەوەی گڕ دەخوێنێتەوە.

# قەسیدەی ڕەنگەکان

گـردی شـین، درەختـی شـین ... چۆڵەکـەی زێڕیـن کـە بەسـەر کێڵگـەی ئەرخەوانیـدا دەفڕێـت. دەسـتی ڕەش کـە لـە کێڵگـەی ئاڵتوونیـدا گەنمی سپی دەدروێتەوە. بەداسـی زیـو لەسـەر پەیـژەی نیلۆفـەری میـوەی زیرەیـی دەچنیـن، کۆتـری سـەوز لەسـەر درەختـی خوێنیـن سـەیری دەریـای سـپی دەکا. شـەوی ڕەش لەسـەر شـانی ئێـوارەی پیرۆزەیـی دەخـەوێ. شـەوی ئـاڵ کـە بەسـیاجی وەنەوشـەیی گیـراوە، گوڵـی تێدایـە سـپی کـە لەسـەر چڵـی ڕەش وەسـتاوە. ئـاوی وەک شـیر کـە بەجۆگـەی قەترانیـدا دەڕوا، ڕێبـواری شـین کـە لـە کەشـتی تـەڵا دێتـە خـوارێ. چارۆکـەی خۆڵەمێشـی کـە بـای سـپی یـاری پێـدەکا. ماسـیگری گەنمڕەنـگ لـە گۆمـی خەزانـدا ماسـی بلوریـن دەگـرێ. فریشـتەی ڕەش لەسـەر دەفـری مـۆر نانـی ئاسمانی دەخـوا. خانمـی کاڵ کـە بەسـوار ئەسـپی بـۆر و بەتـارای زەردەوە دەڕوا. پـیاوانی خۆڵـەمێشـی کە بـە مەتـری زێڕیـن زەوی ڕەش دەپێـون. ئەمیـری زێڕیـن کـە لەسـەر دەغڵـی تاریـک،

گەمـی سـپی دەکێشـێ. مەزاتکارانـی سـیا لـە بـازاڕی دوو ڕەنگـدا ڕەنگـی خۆیـان دەگـۆڕن. کچانـی ڕوو زەرد لـە خەسـتەخانەی ئومێـدا ڕووی خۆیـان سـپیدەکەنەوە، ژنانـی پیـر لـە تەشـتی مسـدا ڕەنگـی نـوێ دەگرنـەوە...

هەموو لەم شارەدا ڕادەکەین بۆ خاکێک ڕەنگی تر لە باغی بچۆڕێ.

هەموو لەم ژوورەدا دەچینە بەر ئاوێنەیەک ڕەنگی ئێمە بگۆڕێ.

# سنوورکێشان

ده ئەندازیـاری غەمگینـن، لـەم نـزاره سـووتاوانەدا، سـنوور بـۆ زەوییـەک دەکێشـن کـە پێشـتر گـڕ کێشـاوێتی. سـنوور لـە نێـوان درەخـت و درەختـدا دەکێشـن، لـە نێـوان بـەرد و بـەردا، لـە نێـوان ئاگـر و ئاگـردا. بـە مەتـری دوورودرێـژ تەمەنـی خـەزان دەپێـون، «با» ئـەم خۆڵەمێشـە بـۆ کـوێ بەرێـت، ئـەوان دوای دەکـەون. باران هـەر هێڵێـک لـە نێـوان ئاگـر و ئێمـەدا بسـڕێتەوە، ئـەوان دەیکێشـنەوە، گـەرداو هـەر دیوارێـک لـە نێـوان ئێمـە و عەدەمـدا بڕوخێنێـت، ئـەوان دروسـتیدەکەنەوە... ئـەی بـەرد خـۆت ماندوومەکـە ... لێرەدا لـە دیـواری خـۆت دەرمەچـۆ. ئێمـە ئەندازیارمـان هەیـە سـنووری نێـوان مـردن و لەدایکبوونـەوە دەڕوخێنـن و دروسـتیدەکەنەوە. یاسـاکانمان هەمـووی لەسـەر جیاکردنـەوەی ئـەم باڵندانـە لـە یەکـتر، ئـەم کێڵگانـە لـە یەکـتر، ئـەم ئەسـتێرانە لـە یەکـتر دروسـتبووه. ده ئەندازیـاری غەمگینـن، دەزانـن لـە کۆتایـی هەمـوو یاسـایەکدا دیوارێـک هەیـە، یاسـایەک بـە زێـڕ دەیکێشـین و بـە گـوڵ دەیپێویـن. ئەندازیارەکانمـان هەمیشـە ئـەو سـتوونانە تۆخدەکەنـەوە کـە خـودا کێشـاوێتی، ئـەو هێڵانـە درێژدەکەنـەوە ئـەو بـە کورتـی جێـیهێشتوون، نـاو لـەو بەردانـە دەنێـن کـە ئـەو نـاوی لێنەنـاون.

گوڵ دەدۆزنەوە دەکەوێتە ئەو دیو ڕێسای ئەم باغەوە. دڕک دەدۆزنەوە لە مێژە زەوی بۆی دەگەڕێت. نەخشەکانی ئەوان هەمیشە لە نزیک کێڵگەی غەمەوە دەڕوات، کە ڕوناکی وەک شەهید بە خاچەکانیدا هەڵواسراوە ... ئەی تیشک خۆت ماندوومەکە، لە ڕیزی ئەم ڕۆشناییە دەرمەچۆ، چونکە ئەندازیارەکانمان ڕوناکی ڕوخاو دروستدەکەنەوە. چۆن ئەندازیارەکانی دی بورجی بەرز لە ئاسن و بەرد دروستدەکەن، ئەوان لە تیشکی شکاو، لە تریفەی وەک ڵم ورد دیواری درێژ دروستدەکەن، فولکەیەک تەنیا یەکێک بەدەوریدا دەسوڕێتەوە لە قیامەت گەڕابێتەوە. ئەندازیارەکانمان هەرگیز ڕاناکەن، ئەوان لە هێمنی خۆیاندا، لە گۆشەگیری خۆیاندا دیلن، بیر لە دیوارێکی بەرز دەکەنەوە، نەهێڵێت چارۆکەی کەشتییە بەرزەکان لە خەونەکانمانەوە دیاربێت، دەیانبینین لە هاوینی گەرمدا بیر لە سنووری نێوان سێبەر و ڕوناکی دەکەنەوە، ناهێڵن تیشک لە ئێوارەدا سنووری خۆی

ببــەزێنێت. لــە زســتانی گەرمــدا دەیانبینیــن هەکتــار لــەدوای هەکتــار، حیســابی ساڵانە لەگەڵ سێبەردا دەکەن. لە زستانی گەرمدا سنوور بۆ بای سارد دادەنێن... ئەی با ... ئەی با ... بێهودە خۆت ماندوو مەکە، دەرمەچۆ لەم گەرداوە. ئێمە ئەندازیارمان هەیە بای هەڵهاتوو ڕاودەکات، ئەی با لە مێژە لێرەدا هیچ شتێک نەڕوخاوە... لە مێژە تەلا بە تەلایی خۆی و بەرد بە بەردێتی خۆی ماوە... چونکە ئێمە ئەندازیارێکمان هەیە، ئەو ئاوانە تۆخدەکاتەوە کە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا وەستاوە.

# زەوی منی دۆزییەوە

وەک ئەو تیشکە وێڵانەی ڕوناکی لەدوورەوە بانگیاندەکات
وەک یەکێک گوێی لە مۆسیقای با بێت کاتێک بۆ دەنگی خۆی دەگەڕێت
وەک پاچێک هەست بە ئازاری خاک بکات... زەوی منی دۆزییەوە
کە بەقووڵایی خۆیدا سەفەریکرد، کە بە تیشکی خۆیدا گەڕا، کاتێ لە زستانی خۆی پرسی و لە گەرمای گاشەبەردی خۆی ڕاما. کە لە سێوی ناو سەبەتەکانی باغی پرسی، کە بەدوای ئاوێنەی خۆیدا سەیری ئەستێرەی دووری کرد ... کە تامی ترێی کرد... کە لەسەر خوانی خۆی دانیشت و لە دەنکی هەناری خوارد ... کە خوێی ئەم کەنارانەی بێژایەوە، کە شەکری ئەم میوانەی پالاوات، کە یاریکرد ... کە بەختی خۆی لەبەر مانگەشەو گرتەوە... کە پشکۆی لەدۆزەخ دزی و گوڵی لە بەهەشت بردەوە ... کە لە باغی کەستانەکاندا چرای داگیرسان، کە لە شارە کۆنەکاندا بۆ منداڵی خۆی گەڕا، کە لەگەڵ پڵنگەکاندا بۆنی جەنگەڵی کرد، کەوەک ماسی ترساو، لەبەر تافگەکاندا بەرەو دواوە بازیدا ...

کـە بـەدوای گیایەکـدا گـەڕا یەکـێ بـە عەشـق ئـاوی دابێـت. ئینجـانەیەک یەکێـک لەترســـی مـردن لێـرەدا خستبێتییە بـەر ڕوناکـی... کـە بـەدوای ئاگرێکـدا گـەڕا ژیـان لـە خۆڵەمێشـیدا مابێـت... کەسـەیری برینـی ئـەو بریندارانـەی کـرد کـە وەک گۆمـی دوور پـڕن لـە تیشـک، کـە یـادی کەوتـەوە پێویسـتی بـە باغەوانێکـە ڕوناکـی بـۆ ئـاو بـدات... زەوی منـی دۆزییـەوە.

نەیویست من بدۆزێتەوە. گووتی : تۆ ئەوە نیت، کە من بۆی دەگەڕێم

بەڵام لە من زیاتر کەس لێرە نەبوو

تـۆ لێـرە نەبوویـت ئـەی دۆسـت، تـۆ لێـرە نەبوویـت، تـا تـۆ بدۆزێتـەوە ... مـن لێرەبـووم ئـەی دۆسـت ... مـن بـە تەنهـا لێرەبـووم ... ئیـدی زەوی هـات و منـی دۆزییـەوە.

# مەحوی

چی بکەم ... گەر وەکو سوختەی شێت تا ئەوسەری مردن بەدواتا بەپێ نەچم؟
چی بکەم... گەر وەکو کەشتی شکاو تا بنی بەحری کوفر نەخنکێم و ڕۆنەچم؟
چـی بکـەم... گـەر وەک قەڵەنـدەری پیـر، شـەوی مـردن، نەگەڕێـم بـە باغەکانـی شـاردا؟
چی بکەم... گەر بۆ «ئادابی جنون» نەگەڕێمەوە بۆ سارا؟
چی بکەم... گەر لە پاداشتی شەودا، بەرق لە دڵم نەگرم؟
چی بکەم... گەر بەبێ تۆ بە یادی نورەوە نەمرم؟
چی بکەم... «سەر» وەک گوڵەباغ لە باغی حیکمەتدا بنوێ؟
چی بکەم ... «دڵ» وەکو بولبول، بە ناوی باغەوە بدوێ؟

چی بکەم ... خودا و خۆر و ئەستێرە تێمبگات؟
چی بکەم ... لەم ئاگرئابادەیا، نەسیمی سوبحم پێبگات؟
چی بکەم ... وەکو نوری وێڵ خۆم نەدەم بە پەنجەرەی مەرگدا؟
چی بکەم ... وەکو پاییزی دوور، نەخنکێم لە گەڵای زەردا؟

# ئێمە هەناری مردووەکان دەخۆین

ئێمە هەناری مردووەکان دەخۆین، ئێمە تا نیوەڕۆ ڕۆژەکانی ئەوان بەسەردەبەین، کە دەچین بۆ گۆڕستان گوڵ لە باغی خۆیان دەکەینەوە، بەسەعاتی ئەوان ڕۆژی خۆمان دەپێوین، ئێمە سێبەری مردووەکان هەڵدەکەنین. لە پاڵ ئەواندا سەنگەرەکانمان لێدەدەین، ئێمە بەرسیلەی مردووەکان لێدەکەینەوە، ئێمە لە تیشکی مردووەکان ڕوناکی دروستدەکەین، ئێمە هەرمێی وەریوی مردووەکان دەچنینەوە.

هیــچ شــتێک نامانوەســتێنێت، هەتــا ئــەو ســەعاتانەی زەمانــی ئێمــەو زەمانــی ئــەوان جیادەکاتــەوە. هەتــا تامــی ئــەو ترێیــەی شــەرابی مــردن لــە شــەرابی ئێمــە جیادەکاتــەوە... ئێمــە تامــردن یەقینــی ئــەوان بــۆ گومانــی خۆمــان دەدزیــن، شــیری ئــەوان بــۆ منداڵــە ساواکانمان دەدزیــن، ئێمـــە لــە بەیانــی مــردوەکان دەستمان پـــڕ دەکەیــن لــە تــەم، لــە ژووری ئەوانــەوە تــۆز بــۆ ماڵــی ســبەێنێمان دەهێنیــن... ئێمــە لاپــەڕەکان هەڵدەدەینــەوە... ئێمــە ڕســتەی مــردوەکان دەخۆیــن، لــە کاتــی ئــەوان دەخۆێنــەوە. ئێمــە تــا زیندوویــن لــە خەزنــەی مــردوەکان مــاچ دەردەهێنیــن... کــە مردیــن ئیــدی مــردوەکان نابینینــەوە، تــا زیندوویــن بابڕۆیــن لــە نانــی مــردوەکان بخۆیــن... شــیری مێگەلــی ئــەوان بدۆشــین... لەدرەختــی ئــەوان هەنــار بکەینــەوە.

# بۆ شاعیران بەجێیانهێشتین؟

لەبەرئەوەی ڕۆحی مرۆڤ وەک جاران پڕ لە ئاگر نییە. لەبەرئەوەی بورکانەکانی ناو مرۆڤ و گیای شەوە ئەفسانەییەکانی ناو مرۆڤ مردون. لەبەرئەوەی تەلا لای زەرەنگەران زۆر و لە ناو دڵی ئێمەدا کەمە، لەبەرئەوەی مرۆڤ چیتر ستایشی با ناکات، هەڵمی دەریاچەکان لێمان دوورن، زەمین چیتر باغی ئەو کەسانە نییە کە لەدوورەوە بۆنی گوڵ دەکەن، دەڕۆین و دەڕۆین... هیچ کاغەزێکمان ناوێت، جێگرەکانی خودا لە سەر زەوی مۆریانکردبێت. شوێن چرای خۆی پێیە ... کات تێشووی خۆی پێیە... هەر کەسە و تیشکێکی هەیە، لە تیشکی کەسی تر ناچێت. گوڵەکان وەک جاران قسەناکەن، بولبولەکان بەدەم خەووە ناخوێنن، هەر پەنجەرەیە و بەسەر باغی زەمانێکی تردا دەڕوانێت ... کەس بۆنی زەمانی کەسی تری لێ نایەت...

لەو دەمەوە شاعیران ڕۆیشتن و بە جێیانهێشتین.

شاعیران چی بکەن کە من و تۆ پێکەوە لەسەر ناوی کێڵگەیەک ڕێنەکەوین، لەسەر ناوی هەموو پەپولەیەک و خودایەک و شەرابێک ناتەبابین. لەو ڕۆژەوەی ستایشی ئێمە بۆ تیشکی وێڵ، بۆ بەزمێک دوای لەدایکبوونی هەر ڕستەیەک دەمانگێڕا، تەواوبوو. لەو ڕۆژەوەی کچان لەوە کەوتن ببن بە قافییەی ڕوناک، ئیدی جوانی ئەوان وەک جاران ناکرێتە پەرداخی مەیەوە، ئیدی چەکوشی ئێمە لەسەر ئەم بەردە ڕەقانە دەنگی نایەت ... چیدی گوێمان لە با نییە ناومان بڵێتەوە، گوێمان لە دەریا نییە بانگمانبکات.

لەو ڕۆژەوە شاعیران بەجێیانهێشتین.

چی لە شاعیران بکەین کە من و تۆ لەسەر ناوی ئەم ڕوناکییە ڕێنەوکەوین. لەسەر مەرهەمێک ڕێنەکەوین لە گەرمای ئەم هاوینەدا بیدەین لە خاک، بیدەین لە هاواری ئێمە کاتێک بە تیشکی یەک دەسووتێین. شاعیران لێرەن تا ئێمە بتوانین لە تیشک تێبگەین. لە کەشتی کاتێک بە سەفا لە بەندەرە دوورەکان نزیک دەبێتەوە. لە قافڵە کاتێک بە خۆشییەوە دەگاتە نزیکی شارە خەوتووەکان.

لـە ماسـی مەسـت کاتێـک کـە خـۆی دەخاتـە تـۆڕەوە. شـاعیران لێـرەن تـا فێربیـن چـۆن گـوڵاوی ئـەم دەریاچەیـە بگریـن. فێربیـن سـەیری ئـەو سـەعاتانە بکەیـن کـە تێدەپـەڕن و ئێمـە پیرنابیـن... سـەیری ئـەو ڕۆژانەبکەیـن کـە دەڕۆن و ئێمـە بـە منداڵـی دەمێنینـەوە. شـاعیران لێـرەن تـا بەیانـی و نێـوەڕۆ و شـەو هەڕەشـەمان لـێ نەکـەن... کات بکوژیـن و زەوی نەمانکوژێـت ... کات بکوژیـن و گوڵەکانمـان هەمیشـە زیندووبـن ... کات بکوژیـن و ئـەم باغـە بـە گوناهبارمـان نەزانێـت ... شـاعیران لێـرەن تـا بەستایشـی خۆیـان ئـەم شـارە چۆڵانـە ئاوەدانبکەنـەوە. بـەڵام کـەس نایەوێـت ئـەم شـارە چۆڵانـە ئاوەدانبکاتـەوە... کـەس نایەوێـت دەریـا بەجێبهێڵێـت و ڕووبکاتـە بەنـدەرە چۆڵـەکان...

ئیتر شاعیران چی بکەن؟

شـاعیران چـی بکـەن کـە کەنارێـک نەمێنێـت دەواری ئـەو ڕۆژانـەی تیـا هەڵدەیـن. ڕۆژێـک ئیمپراتـۆرەکان دەڕوخێـن و تەنیـا هـەور بەدەسـتە نەرمەکانـی حوکمـی ئـەم زەوییـە دەکات، هـەور بـە بارانـی نـەرم سـزامان دەدات.

«ئـاه ... ئـەی گـوڵ فریامـان بکـەوە»... هـاوارێ وامـان گـوێ لـێ نابێـت. «وەرە و بـۆ گـوڵ بگەڕێیـن» دەنگـی.وانابیسـتین.

هەمـوو پـاڵ دەدەیـن بـە دەرگاکانـەوە و بەیانیـان سـەیری مردنـی ئەسـتێرە دەکەین... شـاعیران ناتوانـن بـە پێـوە بوەسـتن و سـەیری مردنـی ئەسـتێرە بکـەن... ناتوانـن هاوارنەکـەن «ئـەی گـوڵ فریامـان بکـەوە». هەمـووش دەزانیـن کـە گـوڵ فریامـان ناکەوێـت. بـەڵام شـاعیران دەڵێـن بـا پێکـەوە هاواربکەیـن «ئـەی گـوڵ فریامـان بکـەوە». هەمـووش دەزانیـن کـە گـوڵ لێـمان ناپرسـێت، دەزانیـن گـەر پێکـەوە هاواریـش بکەیـن «ئـەی گـوڵ فریامـان بکـەوە»، گـوڵ ناتوانێـت فریامانبکەوێـت... ئـاە... ئیـدی چـۆن شـاعیران نەمـرن کـە دەزانـن گـەر پێکیشـەوە هاواربکەیـن گـوڵ ناتوانێـت فریامانبکەوێت. ئەوان بۆیـە دەژیـن تـا بەگـوڵ بڵێـن «ئـەی گـوڵ فریامـان بکـەوە»، تەمەنیـان بـە ئەنـدازەی ئـەو ڕۆژانەیـە کـە تیایـدا فێردەبـن هاواربکـەن «ئـەی گـوڵ فریامـان بکـەوە». ئـەوان ڕۆیشـتن و بەجێیانهێشـتین کـە زانیـان گـوڵ ناتوانێـت فریامانبکەوێـت.

شەوەو دەبارێت. شاعیران ئەسپە سپییەکانیان دەبەستنەوە و لەسەر زەوی بۆنی ئاونگ دەکەن... لێرەوە بەرەو شەوئاباد دەڕۆن. هەر بەفرێک لەسەر ڕابوردوویان باریوە، بە خۆری ئەمڕۆ دەیتوێننەوە. شاعیرەکان دەڵێن «ئەی مۆم ئەم تیشکەت لە کوێ بوو؟». گەرچی مۆم نازانێت تیشکی خۆی لە کوێ بوو، بەڵام شاعیران هەر دەپرسن تۆ تیشکت لە کوێ بوو، من تیشکم لە کوێ بوو وە ئەو تیشکی لە کوێ بوو؟ شاعیرەکان بەجێیانهێشتین کە زانیان ئێمە بیر لە تیشکی خۆمان ناکەینەوە. کەس نایەوێت بیر لە تیشکی خۆی بکاتەوە، نە ئێمە... نە باغەوانەکانی دراوسێمان، چونکە دەزانین بیرکردنەوە لە تیشک زۆر ڕوناکمان دەکاتەوە. ناتوانین لەسەر مانای ڕوناکیش ڕێبکەوین، گەر نەتوانین لەسەر ناوێک بۆ تیشک ڕێبکەوین... شاعیران چی بکەن؟ گەر نەتوانن دووری نێوان ئێمە و کانگاکانی نور بپێون... گەر نەتوانن دووری نێوان ئێمە و مانای ڕۆشنایی بپێون، بێکار لەم باغەدا چیبکەن؟ لە هەموو جێگایەک بێکارن شاعیران.

ئیدی بۆ نەڕۆن... بێکاران لەم باغەدا چی بکەن؟

# گەلێك سادە ... تۆ تەنهایت ئەی دڵ

قسە لە تەنهایی ناکەم... قسە لەوانە دەکەم کە تێناگەن دەریا چەندە تەنیایە.

مـن هەمیشـە دەڵێـم ستایشـت لێبێـت ئـەی دڵ، ئـەی ئـەوەی شـێتی خـۆت بـە شـێتی ئێمـە ناپێویـت. ئێمـە کـە ئێسـتاش نازانیـن ئـەوە دەریایـە تەنهایـە، یـا تەنهاییـە دەریایـە.

نـا ... نـا.. مـن باسـی بێکەسـی ناکـەم، باسـی درزێکـی گـەورە دەکـەم کـە تـۆ لـە هەمـوو شـتێک جیادەکاتـەوە.
باس لە نەبوونی پرد دەکەم، لە نێوان تۆ و هەموو مەخلوقاتدا ... ئەی دڵ.
باس لە نەبوونی پەیمان دەکەم، لە نێوان تۆ و خودادا ... ئەی دڵ

ئێمە هەمووماــان بێکەسین، بەڵام ئەی دڵ پێمبڵێ: تەنهاکان بۆئەوەندە کەمن. تەنهاکان ئەوانەن کە لە دەریا دەچن، ئەوانەن کە ونـدەبن و کەس نایانبینێت، کەس باوەڕیان پێناکات، کەس نایانپێوێت، کەس نازانیت چین و لە چی دەچن ... ئەی دڵ. کەس نازانێت تەنهان، کە زەوی دەخەوێت، کە دەریا دەخەوێت، کە ڕوناکی دەخەوێت، تەنهاکان لە بری زەوی بیر لە بەیانی دەکەنەوە، لە بسری دەریا دەڕوانن، لە بری تیشک سەیری باغچە دەکەن. سڵاوت لێبێت ئەی تەنهایی... کە من کوڕی باغی تۆم ... باغێکی چەندە بچوکە ... باغێکی چەندە نادیارە ... ئەی دڵ.

•

هەموو شاعیران درۆزنن، تەنیا ئەو شاعیرە ئەی دڵ. سڵاوت لێبێت، کە ئەو تەنیا دەزانێت وشەکان لە چی دەچن، ئەو تێدەگات ڕستەکان دەبێت بۆ کوێ بڕۆن، ئەو کتێبەکان دەناسێت... هەر کتێبخانەیەک ئەو بۆی نەچێت، من بۆی ناچم، هەر باغێک شوێنی ئەو نەبێت، شوێنی من نییە، ئەی دڵ.

تەنهاکان لە داوەتە گەورەکاندا دیارنین، هەر شوێنێک پڕ بێت لە دەنگی سەعاتە بچکۆلەکان، لە دوکەڵی ئەو ئاگرانەی مرۆڤ ڕۆژانە دەیکاتەوە، لە سەرابی ئومێدە بچوکەکان. ئەوان لەوێ نین... ئەوان لە نزیک سەعاتی گەورەی ژیانەوەن، لە نزیک دوکەڵی ئومێدە گەورەکانەوە دەبینرێن. سڵاویان لێبێت، کە کەس درەوشانەوەیان نابینێت،

مۆمێکی گەورەن کە تاریکی ناسووتێنن، کەس ڕوناکیان نابینێت، لە هەر شوێنێکدا تیشکێک هەبێت، کەس تێینەگات ئەوان لەوێن. لە هەر جێگایەک هاوارێک بڵێت «ڕوناکییەک هەیە نایبینین» ئەوان لەوێن ... ئەی دڵ.

•

ئەوانی دی تەنیا سێبەری ئەم گۆشەگیرییە دەبینن « وەک گوڵێک تەنیا سێبەرەکەی ببینین». تۆ شارەزایت... تۆ تەنهایی دەناسیت... تۆ گوڵە ڕاستەقینەکانی دەبینیت، تۆ ڕەنگەکانی دەبینیت، شەو و ڕۆژ بۆنیدەکەیت ... ئەی دڵ. تەنهاکان کوڕی ئەم ئاهەنگە نین، کە یەکجار دەرکران ئیتر ناگەڕێنەوە. کە یەکجار برینداربوون ئیتر تا ئەبەد خوێنیان لێدێت... وەک تۆ ... ئەی دڵ.

ئـەوان لـە جێگایـەک دەژیـن کـە لێـرەوە زۆر دوورە، ئەوانـی دی بـە کەشـتی نایگەنـێ، باڵندەکانیـش نازانـن لـە کوێیـە، ڕێبوارەکانیـش نازانـن... دوورگـە نییـە، لـە دوورگـە دوورتـرە ئـەی دڵ، لـە ئاسـمان دوورتـرە، زەوی نییـە، گوڵێکـی تیـا نییـە لەگوڵـی سـەرزەوی بچێـت، هەمـووی ملـی نەبیـنراوە ... هەمـووی ئەسـتێرەی نوێیـە ... بـا نایگاتـێ، بەڵـێ لـە با مەپرسە ئـەی دڵ ... بـا نازانێـت لـە کوێیـە ... وەک تـۆ ... وەک تـۆ کـە هەرگیـز بـا ناتگاتـێ، هیـچ گەرداوێـک دەسـتی پیـات نـاگات ... کـە زۆر لـە دوورگـە دوورتـری ... زۆر ... ئـەی دڵ.

# فێربووم گوێ لە بەیانی نەگرم

فێربووم گوێ لە بەیانی نەگرم، چاوەڕوانی بەیانی نەکەم، بە خۆم بڵێم شتێک نییە ناوی بەیانی بێت. فێربووم بڵێم: گەر بەیانی هەیە، ئەوا پڕە لەو بولبولانەی بۆنی تاریکیان لێدێت، پڕە لەو درەختانەی لە خەو هەڵنەستاون، لەو بەرچاییە تاڵانەی بەدەم خەوەوە دەیخۆین. بەیانیان هەمیشە تیشکی خۆی حیسابدەکات، من فێربووم بێ حیساب بیر لە ڕوناکی بکەمەوە، بێ حیساب تیشکم بوێت. ئیدی گەر بەیانیش هەبێت ، من فیربووم چاوەڕوانی نەکەم. گەر هەشبێت لە ئێسکی ئەوانەی بە شەو مردون دروست بووە، لە هەر ڕوناکییەکی وێڵ کە ڕێگای خۆی نازانێت، لە مۆمێک شەو بۆ سەیرکردنی ڕێگای خۆی دایدەگیرسێنێت. من بیر لە بەیانی وا ناکەمەوە، بۆ بەیانی واناچم کە دەرگاکانی بە کلیلی هەموو کەسێک دەکرێتەوە، بەیانییەکم بۆچییە هەموو خوانەکان پڕبن لە شیری ئەو. گەر هەبێت من لە شیری ئەو ناخۆمەوە. شیری ئەو بۆنی دەستی ئەو ژنانەی لێدێت کە شەو دەدۆشن. من هەر کات لەسەر زەنگەکانی ئەو بە ئاگادێمەوە،

لە پەنجەرەوە هەمان بولبول دەبینم کە گۆرانی تاریکی دەڵێتەوە، من فێربووم گوێ لە زەنگەکانی ئەو نەگرم، بە خۆم بڵێم «ئەوە هەمان زەنگی دوێنێیە کە لێدەدات». فێربووم سەر لە بالیفەکەم بەرزبکەمەوە و بۆنی ئاونگەکان بکەم، بڵێم هەمووی لە دوێنێ کەوتوون ... هەمووی لە جاران کەوتوون ... من هەموو ڕۆژێک تابەیانی تێدەپەڕێت، باوەڕناکەم کە بەیانییە. بە خۆم دەڵێم، گەر بەیانی بایە، من کۆیلەی تازەم دەبینی بە شەقامەکاندا بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە. من دەتوانم لە پەنجەرەوە وەک بینینی بەفر بارینی ئازادی ببینم، بەڵام جگە لە بای دوێنێ کە یاری بە گیای کۆن دەکات، هیچی دی دیار نییە. گەر بەیانی بایە هەموو کاتژمێرە خەوتووەکان هەڵدەستان، بەڵام سەعاتەکان هەمیشە خەوتوون، هەموو شتێک هێشتا بەدەست بروسکەی شەووە ماندووە. دەبیستم سۆفییەکان دەڵێن : خودا لەم نزیکانەیە. تا سۆفییەکان وابزانن خودا لەم نزیکانەیە، واتە هێشتا شەوە، خودا بەیانیان لەم نزیکانە نییە، بەیانیان هەمیشە بۆنی مرۆڤی لێدێت. من دەست لە بەرماڵەکان دەدەم و هێشتا بە نوێژی شەو تەڕن. تا ئیماندارەکان بگرین، من بۆ خۆم لێرەدا دەخەوم.

گەر بەیانی هەبێت ئەوا کرێکارێکی دیکە لە زەنگەکانمان دەدات، ئەندازیارێکی تر دەبینین دێتە سەر ئەم پارچە زەوییەی ئێمە. من فێربووم تا وەستاکان نەبینم چاوەڕوانی بەیانی نەکەم، تا خەلفەکان بە خۆیان و تەناف و میزان و چەکوشەکانیانەوە نەیەن، تاسەعاتچییەکان بە سەعاتێکی ترەوە نەیەن، تا میوەفرۆشێکی تر نەیەت بۆ ئەم کوچەیە ... باوەڕ بە بەیانی ناکەم. فێربووم شەو ناوی هەموو گوڵەکان فێرببم و مێژووی لەدایکبوونی هەموو تیشکەکان بنوسم. زۆرن ئەو کتێبە کۆنانەی وادەزانن ئێستا نوسراون، زۆرن ئەو باغە پیرانەی وادەزانن ئێستا لەدایکبوون. من زەنگی خۆم خامۆشدەکەم و دەخەوم، گەر بەیانی بێت خۆی خەبەرماندەکاتەوە، تا لە پەنجەرەوە بڕوانم و ببینم مرۆڤ بۆ بەیانی دەگەڕێت، دەخەوم ... من لە تاریکیدا بۆ بەیانی ناگەڕێم... تۆ ئەی ئەوەی بەخۆت و کرێکارەکانتەوە لێرەدا بۆ بەیانی دەگەڕێیت، زەوی بۆ هەڵدەکەنیت، باغی بۆ تێکدەدەیت ... دڵنیام گەر بەیانی بێت تۆ دەخەویت... تا تۆ لێرەدا بگەڕێیت، واتە هێشتا شەوە ... بەیانی بۆنی تۆی لێنایەت... بەیانی بۆنی ئەو بولبولانەی لێدێت کە بۆ بەیانی ناخوێنن... بۆنی ئەو مرۆڤانەی لێدێت کە شیعر بۆ بەیانی نانوسن، گۆرانی بۆ بەیانی ناڵێن، سرود بۆ سبەی ناچڕن.

# ڕۆژێك كە ئەستێرە بەشمان ناكات

لـە مێـژە دەزانـم ئەستێرە بەشـمان نـاكات. گـەر تـۆ هەمـوو ئاسـمانت بـۆ خـۆت بوێـت، ئیـدی ئەسـتێرە بەشـمان نـاكات.

لـە مێـژە دەزانـم میـوەی هەمـوو باغەكانـی زەوی بەشـمان نـاكات. گـەر یەكێـك لەوسـەری كوچـە میـوەی هەمـوو باغەكانـی دونیـای بـۆ خـۆی بوێـت. ئیـدی بـاغ بەشـمان نـاكات.

لەمێـژە دەزانـم خۆشەویسـتی بەشـمان نـاكات، گـەر كچێـك بێـت و هەمـوو خۆشەویسـتی دونیـای بـۆ خـۆی بوێـت، خۆشەویسـتی بەشـمان نـاكات.

بولبولەكانیـش بەشـمان ناكـەن، سـنەوبەرەكانیش بەشـمان ناكـەن، تریفەكانیـش بەشـمان ناكـەن.

مـن سـوار کەشـتی ئەوانـە دەبـم کـە هیـچ شـتێک بەشـیان نـاکات، بـەرەو دەریایـەک دەڕۆم کـە بەشـمان نـاکات، بۆئـەوەی ڕوناکـی بەشـمانبکات دەچیـن بـۆ شـەڕ، بـەڵام یەکێـک هەمـوو سـوپاکانی دونیـای بـۆ خـۆی دەوێـت... ئیـدی شمشـێر بەشـمان نـاکات. مـن بەبـێ چـەک دەچـم بـۆ شـەڕ ... کەدەکوژرێـم... خوێنـی مـن ... گۆشـتی مـن بەشـمان نـاکات.

مـن دەڵێـم بـا ئاسـمان ئەسـتێرە بەشبکەین. یەکێـک دەیەوێـت خـۆی هەمـوو ئەسـتێرەکان دابەشـبکات. مـن دەڵێـم بـا دەریـا دڵـۆپ دڵـۆپ دابەشـبکەین، یەکێـک دەیەوێـت خـۆی هەمـوو دەریـا دابەشـبکات... ئیـدی دەریـا بەشـمان نـاکات.

مـن ویسـتم بگەڕێمـەوە بـۆ تەنهایـی، یەکێـک لـەدوورەوە گووتـی «تەنهایـیماڵـی منـە... دەسـت بـۆ تەنهایـی نەبەیـت... مـن تەنهایـی لەگـەڵ کەسـدا بـەش ناکـەم... چونکـە تەنهایـی بەشـمان نـاکات»

ویستم بڕۆم بەرەو شاری پاییزان و لەوێ نیشتەجێبم. یەکێک گووتی «پاییز ماڵی منە، دەست لە خەزان مەدە، پاییز بەش ناکرێت، کە بەشمانکرد... ئیدی بەشی باغی من ناکات».

من دەڵێم ئیدی هیچ شتێکم ناوێت... هیچ شتێک.

بەڵام یەکێک هاواردەکات «سەیرکە هیچی چەند کەمە ... دەستت لادە... هیچی ماڵی منە و بەشی ماڵی تۆ ناکات».

# کوچەی قەسابەکان

مـن کـوڕی شـاری قەسـابەکانم، مـن منداڵـی خێڵـی قەسـابەکانم، لـە کۆڵانـی قەسـابەکاندا، لـە ماڵـی قەسـابەکاندا، لـە مەکتەبـی قەسـابەکاندا گەورەبـووم. مـن لـە کوچـەی سـەربڕینی ئەسـتێرەوە هاتـووم. لـە ڕۆژی یەکەمـەوە خوێنـی کۆتـر دەبینـم لـە جەژنەکانـدا دەخورێتـەوە. مـن منداڵـی بـازاڕە خوێنینەکانـم، کـە بەندۆڵـی سـەعاتەکان خوێنـی لێدەتکێـت، کلیلـی دەرگاکان خوێنـی لێدەتکێـت، لیـرەی سـەرافەکان، مەتـری بـەزازەکان، پیاڵـەی عەتـارەکان... خوێنیـان لێدەتکێـت.

من کوڕی گەڕەکی چەقۆکانم، کە ناوی خودا خوێنی لێدەتکێت
مـن کـوڕی شـاری قەسـابەکانم، دیوانـی قەسـابەکان دەخوێنمـەوە، سرودی قەسـابەکان لـە بەردەکـەم، کـە مردیشـم قەسـابەکان لـە سـەر گـۆڕم دەگریـن و لەسـەرم شـیوەندەکەن.

بـە جلـی قەسـابەکانەوە چـووم بـۆ شـایی قەسـابەکان، لەسـەر چەقـۆ سـەمامکرد، دەسـتی کچـی قەسـابەکانم گـرت، شاباشـم بـە یەکێـک دا شمشـاڵی قەسـابەکانی دەژەن، مـن لـە شـاری قەسـابەکاندا. شـەو و ڕۆژ گـوێ لـە مۆسـیقای قەسـابەکان دەگـرم.

بەختگـرەوەکان پێمدەڵێـن : تـۆ دەبیـت بـە قەسـاب، چونکـە لێرە جگـە لـە ڕۆژنامـەی قەسـابەکان و سـتوونی قەسـابەکان و کتێبی قەسـابەکان هیچـی دی لـێ نییـە.

بەختگـرەوەکان پێمدەڵێـن: قەسـابەکان جگـە لـە زانسـتی مـردن، حـەز لـە زانسـتی دی ناکـەن

تۆ باغەوانێکی خۆشبەختیت... لێرەدا بێئیش دانیشە... قەسابەکان کار بە تۆ ناکەن.
ئەوان بولبول ڕاناگرن... ئەوان گوڵ بەخێوناکەن.

مـن لـە کوچـەی ئـەوان و لـە سـاڵی ئەوانـەوە هاتـووم ... هـاوار، جگـە لـە کوچـەی قەسـابەکان و لەسـاڵی قەسـابەکان شـوێن و زەمانـی دیکـەم نییـە. بـە گەڕەکـی ئـەم هەمـوو چەقۆیـەدا دەگەڕێـم و لـە شـاری قەسـابەکان زیاتـر، شـاری دیکـەم نییـە.

# کات کوشتن

ژیانی ئێمە سات دوای سات کوشتنی زەمانە.
وەک چۆن کەشتییەکان تۆپ دەنێن بەیەکەوە، ئێمە و زەمان تۆپ دەنێین بە یەکەوە.
کات پاپۆڕێکی گەورەیە دەبێت بیخنکێنین. ئێمە کۆمەڵێک چەتەین لەم دەریا تاریکەدا ڕێگا بە زەمان دەگرین.

ئێمە زەمان ڕاودەکەین سەیرکە چۆن سەعاتەکان لە بەردەمماندا هەڵدێن. ئێمە دەگەینە سەر هەر چرکەیەک دەیکوژین ... تادەکوژرێین ئێمە زەمان دەکوژین... مردن ئەوەیە کە ئیدی زەمان نامێنێت بیکوژین... چرکە نامێنێت لە دەستمان ڕابکات. مردن ئەوەیە ڕاوشکاری ئێمە لەم دەشتەدا بەدوای زەماندا تەواو دەبێت.

نەمری ئەوەیە، دوای ئەوەی زەمان نامێنێت، ئێمە دوای سەرابی زەمان دەکەوین، نەمریمان بۆچییە؟ کە زەمانمان کوشت ئیدی بەدوای سێبەرەکەیدا ڕاناکەین ...جەنگاوەرە گەورەکان دوای سێبەری دوژمن ناکەون.

ئیشی ئێمە ئەوەیە زەمان بکوژین... ڕێناکەوین ... زەمان لەوە لاوازترە لەگەڵیدا بچینە پەیمانەوە. لە دوژمنان نابورین ... تا لەسەر ئەم ئەستێرەیە دەژین... شەڕدەکەین، کات دەکوژین، ڕۆژ دەخنکێنین، ساڵ قڕاندەکەین.

# کەشتییەك لە شوشە

باوەڕم وایە ئێستا دەریا باشتر تێمدەگات.
جاران کە زمانی شەپۆلم نەدەزانی، دووری ئەو دوورگانە لەلام نرخی نەبوو
من ڕۆژێک فێری زمانی ئاو بووم و دەمتوانی گوێ لە شیعری ئەو شەپۆلانە بگرم.
گەر زمان نەزانیت، ناتوانیت تێبگەیت دەریا باسی چیت بۆ دەکات
ئاو کە گەورەترین فەرهەنگی هەیە ... ئاو کە هەر وشەیەکی دەمامکی وشەیەکی دیکەیە.

ئاە، گەر زمانی ئاو نەزانیت، هاواری ئەم دەریاچانە تێناگەیت کە بەیانیان یەکدی بانگدەکەن. من ڕۆژێک فێری زمانی با بووم و دەمتوانی بزانم گەردەلوول چی بە کەشتییەکەمان دەڵێت. فێربووم لەنگەرگرتن پێویستی بە نوسینی نامەیەکە بۆ بەندەرە نادیار و دوورەکان. من تێگەیشتم، مرۆڤ دەتوانێت لەگەڵ هەموو شتێکدا قسەبکات. هەتا

تارمایی ئەو چەتانەی کە چاویان لە زێڕی کەشتییەکەمانە، فێربووم نامە بۆ ئەو کەنارانە بنێرم کە لە برسێتی ئێمە دەترسن، ئەو درەختانەی میوەیان لە ئێمە دەشارنەوە.

با کەس لە هیچ دورگەیەک نەترسێت، من فێری زمانی هەموو دوورگەکان بووم، دەتوانم لەگەڵ هەموو ئاوێکدا قسەبکەم ... سڵاو بکەم... سڵاو... بڵێم «درودت لێ بێت ئەی دوورگەی هێمن ». ئەوەی کەشتییەکەی لە شوشە بێت، دەبێت بەرد نەگرێتە ئەم ئاوە. دەبێت فێری زمان بێت، تا گەر کەنارە دوورەکان بانگیانکرد، بگەڕێتەوە. گەر ئەو ماسیگرانەی دەکەونە تۆڕی خۆیانەوە بانگیانکرد... سڵاویان لێبکات. سەر لەو قولاپانە بدات کەسەدان ساڵە چاوەڕوانی نێچیرن. من لێرەم تا دەریا بەم میوانانە بناسێنم، نازانم چەند ساڵە لە ئاودا وێڵم، نازانم ئەم ڕێبوارانە بۆ چ بەندەرێک دەچن. من ناوی هەموو شارەکان دەزانم، بەڵام میوانەکانم هەر یەک بۆ شارێک دەچن لەسەر نەخشەکانی من نین. من دەڵێم «ئەی دوورگەی هێمن، مۆز و قاوەی خۆتمان بۆ دانێ با باریبکەین»، «ئەی خۆر تیشکی خۆتمان بۆ دانێ با لە شەوە تاریکەکاندا پێمان بێت». میوانەکانم شەراب دەخۆنەوە و ناوی شاری خەیاڵیم پێدەڵێن کە لەم دەریایەدا نییە... من دەڵێم هەر کەسێک خەیاڵێکی هەیە، من دەبم بە کەشتییەوانی، هەر کەسێک بیەوێت قسە لەگەڵ ئەم ئاوە بێسنوورانەدا بکات، من دەبم بە تەرجومان.

دەزانم مرواری چۆن لە دوورەوە بانگمدەکات. تەنیا منم دەتوانم بە مرواری بڵێم «سەدەفی خۆت بشکێنە و وەرە دەرێ»، دەتوانم بە ماسییەکان بڵێم «ئەم شوشانەم بۆ پڕکەن لە کافیاری ڕەش». ئەوەی کەشتییەکەی لە شوشە بێت دەبێت بزانێت چۆن داوای هەنگوین لە دەریا دەکات. من دێم و دەڵێم « ئەی دوورگەی هێمن، درود لە درەخت و گیا و گوڵت، هەنگوینی خۆمان بۆ دانێ باباریبکەین».

من زمانی دەریا دەزانم...

ئەو ماسیانە بانگمدەکەن کە هەزاران ساڵە لە تۆڕدا بەجێماون.

من پارچەی ئەو کەشتییە شکاوانە کۆدەکەمەوە کە وەک من لە شوشەن.

من فێربووم کە دەنگی من لە ژێر ئەم ئاوەدا دەبیسترێت.

من فێربووم کە یەکێک هەیە دەزانێت سەد ساڵ جارێک

کاتێک دەریا شێت دەبێت و کەشتییەکانی وەردەگەڕێ

کەشتییەکی شوشە دێت و بە ناو ئەو زریانەدا دەڕوات و بە خەندەوە تێدەپەڕێ

کەشتییەکە زمانی هەموو با یەک تێدەگات...

کەشتییەکە بەدوای ئومێدا دەگەڕێت.

# هەزاران مردن

هـەزار ڕێـگا هەیـە بۆئـەوەی بمکـوژن... هـەزار ڕێـگا بەبـێ خوێـن و بەبـێ خەنجـەر بمکـوژن. هـەزار ڕێـگا کـە هەموویـان دەچنـەوە سـەر دڵـی مـن.

لـە هـەر دەرگایەکـی ئـەمماڵـەوە بێنـە ژووری، دێنـەوە سـەر هەمـان ڕێـگا. ژیـان سـەردابێکی نییـە هەندێـک ڕۆژی تیـا هەڵگریـن، بـە هـەر ڕیواقێکـدا بـڕۆم، دەشـێت لـە کۆتاییـدا بمکـوژن. مـن نازانـم مردنـی خـۆم لـە کوێدایـە، بـە پلەکەکانـدا سـەردەکەوم، مۆمـەکان دادەگیرسـێنم ... هـەزار ڕێـگا هەیـە بۆئـەوەی بیـر لـە مـردن بکەمـەوە ... کاتێـک بیـر لـە مـردن دەکەمـەوە، تـۆ دەتوانیـت بەهێمنـی بێیـت و لـە پشـتەوە بمکوژیـت. مردنـی مـن لێرەدایـە، بـەڵام ئێـرە هـەزار دەرگای هەیـە، هـەزار پیاوکـوژ بـە هـەزار کلیـلەوە چاوەڕانـی هاتنـی تاریکـی دەکـەن، کاتێـک

هـەزار ئەسـتێرە دەرکـەوت، هـەزار مـردن لـە هـەزار ڕێـگاوە دێتـە ژووری. مـن وەک هەمـوو شـەوێک بـە ڕێـگای خۆمـدا دەڕۆم، لەبـەر هـەزار پەنجـەرەدا دەوەسـتم، سـەیری هـەزار ئەسـتێرە دەکـەم، گوڵەباغـەکان ئـاودەدەم و دەڕۆم ... ڕەنگـە چەنـد چرکەیـەک ... چەنـد سـەعاتێک ... چەنـد سـاڵێکی بوێـت تـا یەکێـک لەو هـەزار مەرگە ... لـە یەکێـک لـەو هـەزار ڕیواقـەدا... لەبـەر یەکێـک لـەو هـەزار پەنجەرەیـەدا مـن دەدۆزێتـەوە. مـن مـردن نابینـم بـە کویـادا دەڕوات، مردنیـش مـن نابینێـت ... بـەڵام هـەزار ڕێـگا هەیـە بۆئـەوەی بمکـوژن ... هـەزار ڕێـگا هەیـە کـە هەمـوو دێنـەوە سـەر دڵـی مـن.

من ناتوانم خۆم لە مردن لادەم، لەبەرئەوەی من مردن نابینم
مردن ناتوانێت خۆی لە من لادات، لەبەرئەوەی مردن من نابینێت
هەموو دەزانن هەزار مردن لێرەدا بۆ پیاوێک دەگەڕێن کە هەزار ئەستێرەی هەیە

مـن شـوێنی خـۆم بـە مـردن ناڵێـم، مـردن دەبێـت هـەزار ژوور بگەڕێـت، هەمـوو شـەوێک هـەزار دەرگا بکاتـەوە. نـە مـن دەزانـم بـەرەو کـوێ دەڕۆم و نەمـردن دەزانێـت بـەرەو کـوێ دێـت... بـەڵام دەرگایـەک هەیـە کـە دەرگای مـن و مردنـە ... ژوورێـک هەیـە کـە ژووری مـن و مردنـە.

چونکـە هـەزار ڕێـگا هەیـە هەمـوو دێنـەوە سـەر دڵـی مـن. هـەزار ڕێـگا هەیـە دەگەنـەوە سـەر دڵـی پیاوێـک کـە لـە بـەر هـەزار پەنجـەرەدا ... هەمـوو شـەوێک ... سـەیری هـەزار ئەسـتێرە دەکات.

# نانی ئەفسانەیی

ئـەی نانـی ئاهەنـگ، تـۆ بۆنـی سـەرەتات لێدێـت، بۆنـی تەنورێـک زۆر لـە ئاگـری تێناگەیـن. ئـەی نانـی ڕەش کـە لـە تەنوورێـک دێیتـە دەرێ پـڕە لـە پشـکۆی شـاد، بەختـەوەری ئـەم ئاگـرە لـە تامـی تـۆدا دەخۆیـن، سـەفای ئـەم ئاهەنگـە لـە تامـی تـۆدا دەدۆزینـەوە. ئـەی نانـی ئاهەنـگ کـە دەبێـت هەڵتگریـن بـۆ ڕۆژی پرسـەکان، ئـەی نانـی گـەرم کـە دەبێـت هەڵتگریـن بـۆ وەرزی سـارد، ئـەی نانـی ڕۆح کـە ئێمـە لەسـەر خوانـی لـەش دەتخۆیـن. تـۆ نانەوایەکـت هەیـە دەسـتی بـە ڕوناکـی تـەڕدەکات. ئـەم هەمـوو بەختەوەرییـە چییـە ؟ ... هـەر تـۆ دەگەیتـە سـەر خـوان، هەمـوو بیـر لـە برسـێتی یەکـتر دەکەینـەوە. ئـەی نانـی تەنهایـی کـە لەگـەڵ یەکـدا دەتخۆیـن... تـۆ ئێمـە و دوژمنەکانمـان لـەم باغـەدا کۆدەکەیتـەوە... هەموو سـفرەیەک ڕادەخەیـن و دەزانیـن، تـۆ نانـی خۆشەویسـتیت، کـە لـەدوای شـەڕ دەتخۆیـن. بۆنـی ئاگرێکـت لێدێـت لـە ڕۆحـی مرۆڤـدا داگیرسـابێت، بـە شـەراب تەڕتدەکەیـن، دەتبەین بـۆ هەمـوو مەیخانەیـەک... تـۆ نانـی هوشـیاریت کـە لـە ڕۆژی مەسـتیدا دەتخۆیـن.

تۆ لە خەونی گەنم دروست بوویت، لە پریشکی ئومێد کاتێک شوو بە هەتاو دەکات، کە دەتخۆین مەستیمان پڕدەبێت لە ئاهەنگ ... خوێنمان هەست بە بەهار دەکات. ئۆردویەک لە تۆ هەڵدەگرین و بەرەو بەهەشت دەڕۆین ... ئەی نانی ڕوناکی کە بۆ شەوی تاریک هەڵتدەگرین ... ئەی نانی سپی کە لە ڕۆژی ڕەشدا دەتخۆین. تۆ دوا تێشووی ئێمەیت. لەم برسێتییەدا ... ئەی نانی شیرین کە لەگەڵ هەنگوینی تاڵدا دەتخۆین، ئەی نانی وشک کە لەگەڵ فرمێسکی تەڕدا دەتخۆین.

# ئاوەدانکردنەوەی هیچی

زەوییەکە هیچی تێدا نییە، نەدرەخت، نە باڵندە، نە ئاسمان
زەوییەکە ناتوانین لەسەری بڕۆین، چونکە ڕێگای تێدا نییە.
دەمانەوێت بگەڕێینەوە ... ناتوانین.
خاکێکە میوەمان ناداتێ، بەڵام دەتوانین لێرەدا بەڕوونی... بێ فریوی ئومێد، بیر لە هەموو باغێک بکەینەوە. زەوییەکە باغی تێدا نییە، گوڵمان ناداتێ، کە گوڵ نەبوو وەرزی تێدا نییە. بێ وەرز دەگەینە ساڵێک، سەعات و ڕۆژ و هەفتەی تێدا نییە. لەوێ بە ڕوونی بێ فریوی مردن دەتوانین بیر لە زەمان بکەینەوە ... زەوییەکە حیسابی تێدا نییە. لێرەدا دەتوانین مەترەکانمان هەڵگرین و دڵنیابین گەیشتوینەتە زەوییەک بێ خاوەن، زەوییەک پێوەر و تاپۆی تێدا نییە.

کچێک دێت و دەپرسێت: ئەم زەوییە لە تۆ زیاتر هیچی دیکەی تێدا نییە؟
منیش دەڵێم: بەڵێ، ئەم زەوییە لە تۆ زیاتر، هیچی دیکەی تێدا نییە.

درەختێک دەپرسێت: گەر ئەم زەوییە لە ئێوە زیاتر کەسی تێدا نییە، دێم و دەبم بە درەختێک لە زەوییەکدا لە ئێمە زیاتر هیچی تێدا نییە. من دەڵێم: ئەم زەوییە لە من و تۆ و درەختێک زیاتر هیچی تێدا نییە. بولبولێک دێت و دەڵێت: ئەم زەوییە گەر لە ئێوە و درەختێک زیاتر هیچی تێدا نییە، من دەبم بە بولبولێک لە باغێکدا لە من زیاتر بولبولی تێدا نییە. من دەڵێم : ئەی بولبول، گەر دواتر ویستت بفڕیت، ئەم زەوییە ئاسمانی تێدا نییە. بولبول دەڵێت : من لە جێگایەکەوە هاتووم ئاسمانی تێدایە نییە... بولبولی تێدا نییە... درەختی تێدا نییە. دواجار ئاسمان دێت و دەڵێت: من دوای بولبول کەوتووم. ئێمە دەڵێین: ئەی ئاسمان وەرە، ئێرە تەنیا زەوی دونیایە کە ئاسمانی تێدا نییە، کە ڕۆژی تێدا نییە، کە حیسابی تێدا نییە.

کە ئاسمان دێت دەستدەکەین بە پێوانەکردنی زەمان. درەخت دووری نێوان خۆی و پاییز دەپێوێت... بولبول درێژی گۆرانییەکانی بەیان. من درێژی ڕۆژ دەپێوم و ئەو درێژی شەو. کە ئاسمان دێت هەموو دەستدەکەین بە حیسابی ڕۆژ و ئەستێرەکان ... ئیتر خاکێکمان هەیە دەیپێوین ... زەوییەکمان هەیە لەسەری دەڕۆین ... زەوی کات ... زەوی شوێن... زەوی ژمارەکان.

# ڕاو لە ئاوێنەیەکی دیدا

هەتا دەمەو بەیان، بەسەرشان نێچیری مردوو هەڵدەگرین. ئەو پاسارییانەی لە هێلانەی ئومێدەوە ڕایانکرد بەسەر ئێمەدا دەفڕن. ئەوەتا بە خۆمان و تاپڕە کۆنەکانمانەوە، دووبارە نیشانە لە میوەی خەوتوو دەگرینەوە.

پاییز هەمیشە پڕە لە نێچیری لە خەزاندا ونبوو

ڕاوە و تفەنگەکانمان لە دەنگی گوللەی خۆیان دەترسن

«با»ش لە ترسی ئێمە خێراتر ڕادەکات

لە بولێڵی بەیاندا درەخت لە خەوهەڵدەستێنێت و گیا هاوار لە گیا دەکات.

ئێمەش بەسەرشان ، هەتا قیامەت نێچیری مردوو هەڵدەگرین

گوێمان لێیە نێچیرەکانی دوێنی هاوار لە نێچیری ئەمڕۆ دەکەن.

گوێمان لە دەنگی ئەبەدی گوللەکانمانە لە تەمدا هاواردەکەن.

نێچیرەکانمان چاوەڕوانی یەکێکن لە ڕوناکیدا سەیری مردنیان بکات
هەموو دەمرین، بۆئەوەی ئەوانی دی لە ڕوناکیدا سەیری مردنمان بکەن
ئێمە سەیردەکەین و لە چاوی نێچیرەکاندا خۆڵەمێشی خۆمان دەدۆزینەوە
برینی نێچیرەکان ئاوێنەی برینی ئێمەیە
کاتێک نێچیرەکان دەدەین بە شانماندا و بەرەو قیامەت دەڕۆین
لە ئاوێنەیەکی دیدا... ئێمە نێچیرین و لەسەر شانی ڕاوچییەک بەرەو قیامەت دەڕۆین
کاتێک ئێمە بە خەزاندا دەڕۆین و بۆ نێچیر دەگەڕێین
لە ئاوێنەیەکی دیدا یەکێکی دی بە خەزاندا دەڕوات و بۆ ئێمە دەگەڕێت
من تۆ دەدەم بە شانمدا ئەی نێچیر و بەرەو مردن دەڕۆم
وەک چۆن تۆ منت داوە بە شانتدا و بەرەو مردن دەڕۆیت
نە من پێش تۆ دەگەم و نە تۆش پێش من
چونکە دواجار هەموو نێچیری یەکین
یەکدی هەڵدەگرین و بە هێمنی بەرەو مردن دەڕۆین

# خۆڵەمێشی ساقی

من خۆڵەمێشی تۆ هەڵدەگرم، خۆڵەمێشێک کە ئێستاش هاواردەکات. من کوپەی شەرابی تۆ هەڵدەگرم، کە مەستی لە بیردەچێت و باغی لە بیرناچێ. من ترێی تۆ دەشارمەوە، ترێیەک کە نابێت بە مەی و دەبێت بە هوشیاری. لە دەغیلەی دێرینی تۆدا لیرەی مەست دەدۆزمەوە کە ئیتر پارە ناکات ... ئەسکەناس و قرانی سەردەمی سوڵتانەکان، ڕوپێی ئەو عاشقانەی بێهۆشیان دەکڕی، زێڕی ئەو دێوەرانەی لە قوماردا دەمردن و لە خوماردا دەخنکان. من لەم شوشەیەدا خۆڵەمێشی تۆ هەڵدەگرم کە ئێستاش وەکو دوێنێ گەرمە. لەم شوشەیەدا ڕۆحی مەیخانە هەڵدەگرم کە ئێستاش وەکو دوێنێ مەستە

یادی ئەو ڕۆژانە هەڵدەگرم کە پڕبوون لە حیکمەتی مەخمور، پڕبوون لە بادەی ناپاک خۆڵەمێشی تۆ و ئەو مەینۆشانە هەڵدەگرم لێرە سووتان... لێرەدا بوونە خاشاک.

## لەش و سێبەر

نا تا ئێمە نەبینە سێبەر. لە لەشمان تێناگەین. لەشمان کە بۆنی جەنگەڵی لێدێت کاتێک زەمان لە ناویدا وندەبێت، لەشمان، کە ڕۆژەکان لاشەی خۆیان لە ناویدا دەنێژن. ئەوەتا پڕبووە لە لاشەی ساتەکان کە وەک گەڵای پاییز لێرەدا وەریون... پڕبووە لە چرکەی مردوو کە وەک پاساری لێرەدا کەوتوون.

ئاە ئەی لەش... ئەی گۆڕستانی گەورەی زەمان.

ئەی لەش چ دەریایەکی ئەم هەموو ڕۆژە لە تۆدا دەخنکێت. چ زەنگێک لە تۆدایە، دەنگی ئەم هەموو هاوارە نابیستیت. بەرەو خەرەند دەمانبەیت، گەرچی دەزانیت ڕۆحمان بانگتدەکات : بوەستە ئەی لەش ... بوەستە ئەی لەش ... بوەستە ئەی لەش.

ڕۆح وەک تــۆ کاتی خـــۆی بـە فیـرۆ نـادات، ڕۆح وەک تۆ خـۆی ناخنکێنێـت. ئەوەتا کاتژمێـرەکان بـە بەرزی لێـدەدەن... ڕۆژەکان لێدەدەن... چــرکـــەکان و ساڵـــەکـان ... بـەڵام تـۆ سـەیری هیـچ کاتژمێرێـک ناکەیـت... تەنیـا ڕۆح سـەیری کاتژمێـرەکان دەکات... تەنیـا ڕۆح زەمـان دەخوێنێتـەوە... ڕاکـە بـەم کوچـە خاڵییـەی خۆتـدا، ڕاکـە بـە گۆڕسـتانی بێسـنووری خۆتـدا. تـا نەبیـت بـە سـێبەر ئـەی لـەش بێسـوودە و مـن دەسـت لـە تـۆ نـادەم... ببـە بـە تارمایـی ئـەی لـەش، تـا نەبیـت بـە تارمایـی ... ناتگـرم... ناتگـرم و لـە تـۆ ناگـەم.

# دزینی دەریاچەیەك

ئەمە ئەو دەریاچە غەمگینەیە، کە ئەمشەو من و تۆ دەیدزین.
ئەمە ئەو ماسیانەیە کە بانگماندەکەن
ئەمە ئەو بەلەمانەیە کە هاواردەکەن بیانبەینەوە بۆ زەوی
ئەمە ئەو دەریاچەیەیە کە نازانین هی کێیە.

هاواردەکەین: ئەم ئاوە گەورەیەماڵی کێیە؟ هاواردەکەین کێ خاوەنی ئەم هەموو ماسییە مەزن و کەنارە غەمگینانەیە؟ ... جگە لە بێدەنگی هیچی دیکە نابیستین. جارچییەکانمان بە هەموو زەویدا جاڕدەدەن، هاوار لە مەلەکوت دەکەین و دەپرسین: ئەم دەریاچەیە ماڵی تۆیە؟. پیاوانی مەلەکوت پێماندەڵێن: ئەمە لە دەریاچەی ئێمە دەچێت، بەڵام نا ئەمە دەریاچەی ئێمە نییە، باڵندەکانی ئەم دەریاچەیە لە باڵندەی خودا ناچن. نا ... نا نا گیای ئەم دەریاچەیە و ماسییەکانی لە دەستکردی ئێمە ناچن.

لە ئەستێرەکان دەپرسین ئەمە دەریاچەی ئێوەیە؟. ئەستێرەکان دەڵێن : ئەمە لە دەریاچەی ئێمە دەچێت ... بەڵام نا ... نا نا... ئەم ئاوە بەجۆرێک ڕوناکە، ئەم ڕۆخە بەجۆرێک مەستە، وەک دەریاچەی ئێمە نییە.

سێ جار بەزەویدا جاڕدەدەین و دەپرسین: ئەم دەریاچەیە هی کێیە؟ ماسییەکان و باڵندەکان و درەختەکان، هەموو حاشای لێدەکەن.

ئەمشەو من و تۆ ئەم دەریاچەیە دەدزین... بەڵام بۆ کوێی بەرین؟

من لە ماڵی خۆمدا شوێنی دەریاچەی وا غەمگینم نییە

تۆش لە ماڵی خۆتدا شوێنی دەریاچەی واغەمگینت نییە.

ئیدی یەکێک لە دوورەوە دێت و لێمان دەپرسێت: ئەمە دەریاچەی ئێوەیە؟

سێ جار لە نیوەڕۆدا جاڕدەدات: ئەمە دەریاچەی ئێوەیە؟

ئێمە سێ جار حاشای لێدەکەین... سێ جار دەڵێین: ئەمە لە دەریاچەی ئێمە دەچێت، بەڵام نا ... نا نا... ئەم ئاوە بەجۆرێک غەمگینە، ئەم ئاوە بەجۆرێک تەنهایە... سوپاس... سوپاس.. کە ئەمە دەریاچەی ئێمە نییە ... سوپاس... کە ئەمە ئاوی ئێمە و ئەمە کەناری ئێمە نییە.

# ڕوناکبوونەوە

ڕوناک دەبینەوە بە بۆنی گوڵەباغ، بە شەپۆل کە یاری بە مردنی دەریا دەکات. بەدەنگی ئەو زەنگانەی بەربەیان دەکێشن بە ژیانماندا، بەسەیرکردنی با کە بەخەونەکانمدا تێدەپەڕێت، ڕوناک دەبینەوە و لەبەر ڕوناکی خۆماندا دەتوانین ڕوناکی تر بدۆزینەوە. ڕوناک دەبینەوە بە هاواری ئەو سوارچاکانەی داوای کۆمەک لە ئەستێرەدەکەن، بە تەپوتۆزی ئەو ئەسپانەی نائومێد لە مەیدان هەڵدێن، بەدەنگی ئەو شمشێرانەی دەکێشن بە گەردنماندا، بەدەنگی ئەو تیرانەی دەمانپێکن. ڕوناک دەبینەوە و لەبەر ڕوناکی خۆمان سەیری ئەوانەدەکەین کە بۆ ڕوناکی خۆیان دەگەڕێن. ڕوناک دەبینەوە بەو ئازارانەی کە نایانگەینێ، بە شەڕێک ناگەینە سەنگەرەکانی، بەفڕینی

باڵندەیەک لە کۆتایی تیشکەوە هاتووە، بە ڕاوکردنی کەرویشکێک لە تاریکی ڕادەکات، من ڕوناک دەبمەوە، چونکە بەبێ ڕوناکی ناتوانم تاریکی خۆم ببینم. من ڕوناک دەبمەوە بە خوێنی ئەو مێگەلانەی لێرەدا دەکوژرێن، بە چەقۆی ئەو قەسابانەی گۆشتی ئێمە دەفرۆشن، بە پێکەنینی ئەو ئەمیرانەی لە خوێنی ئێمە دەخۆنەوە ... من ڕوناک دەبمەوە بە گوڵێک کە لە من دەورێت

گەر ڕوناک نەبمەوە، تێناگەم... لە مندا ... لە تۆدا... چی بووە و چی هەیە و چی دەبێت.

# گەڕان بەدوای وشەیەکدا

من بەدوای وشەیەکدا دەگەڕێم، وشەیەکی زێڕین. وشەیەک بەبێ ئەو هەموو وشەکان دەمرن. وشەیەک بۆنی ئاسمانی لێبێت، وشەیەک خودا بۆ خۆی دروستیکردوە، وشەیەک کلیلی هەموو کتێبەکانە، بەبێ ئەو زانستەکان هەموو دەمرن، وشەیەک گوتنی پڕماندەکات لە نەغمە، کلیلی هەموو تاریکییەکی پێیە و دەرگای هەموو نۆتە سیحراوییەکان دەکاتەوە، وشەیەکە بەبێ ئەو تیشووومان بەشی هیچ ڕێگایەک ناکات. وشەیەک بەلەمی ناو هەموو دەریایەک و هێزی هەموو بایەکە. بەبێ ئەو شەرابمان ژەهر و میوەمان لە باغدا پێناگات. بەبێ ئەو دەستمان زەفەر بە تیشک و دڵمان زەفەر بە نوری ئەستێرە نابات.

تۆش بەدوای وشەیەکدا دەگەڕێیت، ئەستێرە ونبووەکانی پێبانگبکەیت. کتێبە ونبووەکانی پێبدۆزیتەوە، وشەیەک کەشتییە خنکاوەکان لە خەو هەستێنێت و گیای مردووی ئەم چیمەنە زیندووبکاتەوە، وشەیەک مردووەکان بتوانن بینوسن و بای دوور بتوانێت وەڵامیبداتەوە. وشەیەک گەردەلوولەکان بوەستن بۆئەوەی بیبیستن و فریشتەکان هەستن بۆئەوەی تێپەڕێت. وشەیەک شیعر لە بەردەمیدا بلەرزێت و گەورەیی بنوشتێتەوە ... وشەیەک کە نازانین چییە... دێت و لەگەڵیدا دڵ دەژی و ڕۆح دەگەشێتەوە.

# ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن

ئـەی بەنـدەری دۆسـت، ئێمـە و کەشـتی دوژمنـە غەمگینەکانمـان لـە لای تـۆ لەنگەردەگریـن. ئێمـە گۆرانـی تاریکیـمان لەبەربـوو، نیوەشـەومان پڕبـوو لـە چـرای پاسـەوانە مەسـتەکانی تـۆ، ئێمـە هاتوویـن لای تـۆ ببینـە پەنابـەر...
هەموو لە دوژمن هەڵهاتووین... چ ئێمە و چ دوژمنانمان.
لەسەر شەقامەکانی تۆدا بە دوژمن دەگەین و دەزانین لە تیری ئێمە هەڵهاتوون.
دوژمـن دەمانبینێـت و تێـدەگات ئێمـەش غەریبیـن و ئاوارەیـن، لـە شـیری ئـەوان هەڵهاتوویـن.

کەس ناتوانێت لای ئاو ببێتە پەنابەر... کەس ناتوانێت.

هەموو هاتووین بۆلای تۆ، ئەی بەندەری دوور و هەمیشە دوور... تا خۆمان لە یەکدی بشارینەوە... تا خۆمان لە کەشتییەکانی خۆمان ونبکەین... کە هەمیشە بانگماندەکەن و دەیانەوێت تێبگەن ئێمە لە کوێین... ئێمە دەڵێین، لەسەر زەوی هەموومان پەنابەری ئەبەدی ناو ئەم ڕۆشناییەین. هەموومان هەڵهاتووی ئەبەدین بەرەو تیشک. بمانناسە ئەی بەندەر، بمانناسن ئەی ئەوانەی باری نائومێدی ئێمە بە کۆڵ دادەگرن، بمانناسن بە چ حەسرەتێکەوە بۆ کۆتایی دەگەڕێین، وەرمانگرە ئەی بەندەر، پەنامانده ئەی دۆست و ببینە چۆن کەشتییەکانمان تەقە لە یەکتری دەکەن.

دەرگاکانت بکەرەوە ئەی بەندەر... دەرگا گەورەکانت بکەرەوە.
با ئێمە و دوژمنانمان پێکەوە ئاسوودە دانیشین.
سەیرکە... هەموو لە نوتفەی ڕەش، لە زەریای تاریکەوە هاتووین.
لە شەپۆلی شێت، لە زریانی سیا، لە کەشتی دوژمن هەڵهاتووین.

# تۆ چی دەبینیت... ئەی درەخت؟

ئەی درەختە بەرزەکان کە هەمیشە دوکەڵی ئەم ئاسمانە لەسەر دەستتانە، بیر لە چی دەکەنەوە کاتێک هێلانەکانی سەرتان پڕدەبێت لە هێلکەی ڕەش. ئەی درەختە بەرزەکان کە بە شورای نزم، بە ڕاوکەری ترسنۆک، بەفاقەی کۆن گەمارۆدراون.

ئەی درەختە بەرزەکان کاتێک بروسکە بەسەر سەرتاندا دەڕوات، گوێتان لە دەنگی پێیەتی؟. گوێتان لە گەڕانەوەی هەورە لە جەنگە دوورەکان؟ گوێتان لە هەنسکی پەلکەزێڕینەیە کە لەسەر شانتان دەمرێت؟ ئەی درەختە بەرزەکان کە بە ئاوی ڕەش، بە شاری ڕەش، بە کێڵگەی ڕەش گەمارۆدراون.

یەکێک کە بەدوای موقەدەسەکاندا دەگەڕێت، پاچ لە ڕەگی ئێوە دەدات . ئێوە کە بەدیواری کۆن، بە پاسەوانی پیر، بە عاشقی نەخۆش گەمارۆدراون.

گوێمان لە با یە وەک شێت قامچی لە گەڵای ئێوە دەدات. گوێمان لە زریانە دەیەوێت ئەم خەڵوزە خەوتووانەی ژێر ئێوە بگەشێنێتەوە. هەست بە چی دەکەن کە ئەم تووتییە پیرانە خەونەکانتان بۆ یەکدی دەگێڕنەوە ... کە بە ئێسکی خێڵە بەباچووەکان ... بە ئێسکی گیانەوەرە بەباچووەکان، بە خوێنی بولبول گەمارۆدراون.

چی دەبینن کە شەو بە کوێری سوپا ماندووەکانی خۆی دەدات بەسەر شانتاندا. چی دەبیستن کە ئەستێرە هاواردەکات بیگرنەوە. لە مێژە ئێمەش دەمانەوێت بێینە سەر شانتان و هێلانەبکەین. دەشێت ... ئاخۆ دەشێت، چاوەڕوانی میوەیەک لە ئێوەبکەین، کە خواردمان دڵمان بە ئیشک بگەشێتەوە؟

ئـەی درەختـە بـەرزەکان، ئێـواران کاتێـک دەسـتی ئێـوە پـڕە لـە هێلکـەی باڵنـدە، پـڕە لـە شـەرمیان کاتێـک باڵـی خۆیـان بـە گـەڵاکان دەسـڕن، پـڕە لـە لێبوردنـی نـوسراوی تیشـک کاتێـک لەبەردەمـی ئێـوەدا خۆیـان دەکـوژن. ئێـوە دەسـتتان پـڕە لـە گـەڵای پاییـز، بەجۆرێـک ناتوانـن وەرزی تـر بخوێننـەوە، ئیـدی نابینـن بـە کەفـی ڕەش، بـە فرمێسـکی ڕەش، بـە خوێنـی ڕەش ئـاودراون.

ئـەی درەختـە بـەرزەکان گـەر ڕۆژێـک ویسـتتان هەڵبێـن لـە هێلکـەی ڕەش لـە هێلانـەی ڕەش، لەبیرتـان بێـت کـە لـە مێـژە منیـش لەگـەڵ ئێـوە... بـە تـەوری ڕەش... بـە دەریـای ڕەش ... بـە هـەوای ڕەش گەمـارۆدراوم.

# فرۆشتن

بەرلەوەی با ڕاومبنێت، بەر لەوەی دەریا ڕۆحی من بەم کەشتیانە بفرۆشێت.
بەرلەوەی تۆفان بەبێدەنگییە قوولەکانمەوە، لە خودا بمکڕێتەوە. دەمەوێت
خۆشەویستی تۆ بفرۆشم و بڕۆم بۆ دوورگەیەکی ئاسنین و لەوێ بمرم.
لە بازاڕەکاندا دوکانداری زۆرم بینی، سەوای عەشقی تۆیان کرد، کێشانەی زۆرم
بینی خۆشەویستی تۆیان بۆ کێشام... بەڵام کەسیان کڕیاری خۆشەویستی تۆ
نەبوون. وەک چۆن بولبولێکی دیل لەقەفەزدا فڕینی خۆی بە خەیاڵ دەپێوێت
خۆشەویستی تۆم پێوا. دواجار دەمەوێت خۆشەویستی تۆ بپێوم و بچم بۆ
شارێکی دی و لەژێر سێبەرەکانیدا بمرم.

ئیدی لە کوچەکاندا ئەوانە بانگیانکردم کە خۆشەویستی دەکڕنەوە
لە بازاڕەکاندا ئەوانەی عەشق دەفرۆشنەوە، سەوایان لێکردم
بەڵام کەسیان نرخی خۆشەویستی تۆیان نەدامێ

ئەزیزم... بەر لەوەی خودا بمفرۆشێت و ئەهریمەن بمکڕێتەوە
دەمەوێت عەشقی تۆ بفرۆشم و بڕۆم بۆ بەحرێکی دوور و بیر لە کۆتایی بکەمەوە
گەر کڕیارێکم بۆ عەشقی تۆ هەبێت، ئیدی باکم بە هیچ نییە
دەمەوێت بەرلەوەی بمرم بزانن، عەشقی تۆ ئاسان نییە
بەڵام ئەوەتا گەرچی ئەستێرە و سەراب و یاقووتی نەبینراوی زەریاشم دەدەنێ
هێشتا کەس نرخی ئەڤینی تۆ نازانێت
کەس نرخی خۆشەویستی تۆی پێ نییە.

# ئەو ڕۆژانەی کە ماون

ناونیشـانی ماسـییەک وەردەگـرم و دەڕۆم بـەرەو دەریـا. دەڵێـن ئـاو گەلێـک کتێبـی نەکـراوەی تێدایـە کـە بـە مـن نائاشـنان. ماندووبـووم لـە خوێندنـەوەی بـا و هـەور و ئادەمیـزاد. هێنـدەم بـاغ خوێنـدەوە و تێینەگەیشـتم، ئێسـتا دەمەوێـت بەختـی خـۆم لـە ئیشـێکی تـردا تاقیبکەمـەوە.

ناونیشـانی مردنێـک وەردەگـرم و دەڕۆم تادەگەمـە بـەر پەنجـەرەی. دەڵێـم ئـەی مردنـی بـرام، ئـەو ڕۆژانـەی کـە ماومـە دەیـدەم بـە تـۆ، لـە بـاغ و لالەزارەکانتـدا، لـە خوێندنـەوەی ژیانـی کـۆن و سـەیرکردنی خۆتـدا بیبەرەسـەر، لـە بۆنکردنـی ئـەو گوڵانـەدا کـە لەسـەر گـۆڕەکان دادەنرێـن، لـە پیاسـەکردن بـە بلـواری درێـژی ئومێـدە دوورەکانـدا. تـۆ زۆر لەسـەر مـن وەسـتایت... ئیـدی ئـەو سـاتانەی ماومـە دەیـدەم بـە تـۆ ...

چیم هەیە بیبە و مەترسە... چیم هەیە بیبە و غەم مەخۆ.

ناونیشانی دولفینێکی بچکۆلانە وەردەگرم و بە پۆستدا ژیانی خۆمی بۆ دەنێرم. دەمەوێت دوور لەم ژیانە، خۆم بە شتێکی دییەوە خەریکبکەم. دەمەوێت هەموو ئەو ڕۆژانەی کە ماومە، بیدەم بە ماسییەک لە ئاوێکی دووردا. هەموو ئەو کاتژمێرە بێسوودانەی ژیانم کە تەنیا غەم ڕپیاندەکاتەوە، دەیدەم بە دولفینێک، لە زوڵمەتی ئەم ئاوەدا گەورەببێت و پێبگات. دەیدەم بە نەورەسێک، باشتر لە من... باشتر لە تۆ، لە جوانی ئاو، لە سیحری دەریا تێبگات.

ناونیشانی نەهەنگێکی گەورە وەردەگرم و دەڕۆم تا دەگەمە ماڵیان... لەوێ دەڵێم ئەی نەهەنگی برام، من زیادم لەسەر ئەم زەوییە و لە تۆزی کینەدا خنکام. دەمەوێت ئاسوودە دانیشم.

گەر قەبووڵتە ... گەر تۆش وەکو من ماندوو نیت

ئەو ڕۆژانەی کە ماومە، دەیدەم بە تۆ لەم بەحرەدا.

دەیدەم بە هاوڕێیەکت لە ئاوێکی دیکە و لە گەرداوێکی دیکەدا.

# کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

| ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|
| ١. بنەڕەتەکانی فەلسەفە | د. حەمید عەزیز | |
| ٢. کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە | د. فەرهاد پیربال | |
| ٣. ڕێبازە ئەدەبییەکان | د. فەرهاد پیربال | |
| ٤. نەتەوەی زێرابەکان | جەبار جەمال غەریب | |
| ٥. ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی | د. جەعفەر عەلی | |
| ٦. سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی... | د. جەعفەر عەلی | |
| ٧. مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و... | د. ئەحمەدی مەلا | |
| ٨. نهێنییەکانی ژیان | ئۆشۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٩. کورتیلەیەک لە مێژووی کات | ستیڤن هۆکینگ<br>لیۆنارد ملۆدیتۆ | حوسەین حوسەینی<br>د. هیوا عومەر |
| ١٠. کۆشک | فرانتس کافکا | عەتا نەهایی |
| ١١. فەصلول مەقال | ئیبن ڕوشد | مەریوان عەبدول |
| ١٢. شۆڕشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا | وریا ڕەحمانی | |

| | | |
|---|---|---|
| ١٣. دەسەڵات و جیاوازی | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٤. لە چ ئێستایەکدا دەژین | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٥. شوناس و ئاڵۆزی | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٦. دین و دونیا | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٧. سیاسەت و دونیا | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٨. کتێب و دونیا | مەریوان وریا قانیع | |
| ١٩. دواهەمین هەناری دونیا | بەختیار عەلی | |
| ٢٠. ئێوارەی پەروانە | بەختیار عەلی | |
| ٢١. جەمشید خانی مامم | بەختیار عەلی | |
| ٢٢. مەرگی تاقانەی دووەم | بەختیار عەلی | |
| ٢٣. کەشتی فریشتەکان (١) | بەختیار عەلی | |
| ٢٤. کەشتی فریشتەکان (٢) | بەختیار عەلی | |
| ٢٥.شاری موسیقارە سپییەکان | بەختیار عەلی | |
| ٢٦. سێوی سێهەم | بەختیار عەلی | |
| ٢٧. لە دیارەوە بۆ نادیار | بەختیار عەلی | |
| ٢٨. وەک باڵندەی ناو جەنگەڵە ترسناکەکان | بەختیار عەلی | |
| ٢٩. چێژی مەرگدۆستی | بەختیار عەلی | |
| ٣٠. ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن | بەختیار عەلی | |
| ٣١. مەعریفە و ئیمان | بەختیار عەلی<br>هێمن قەرەداخی | |
| ٣٢. دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکاو... | گۆران ئیبراهیم صاڵح | |
| ٣٣. سەمەرقەند (چ٢) | ئەمین مەعلوف | د. ئەحمەدی مەلا |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٤. وێستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی | فاروق ڕەفیق | |
| ٣٥. ئەخلاقناسی | تەحسین حەمە غریب | |
| ٣٦. گەشەسەندنی ڕامیاری... | د. ک. پێسچانی | د. ئارام عەلی |
| ٣٧. مێژووی کۆنی کورد (چ٢) | د. جەمال ڕەشید<br>د. فەوزیە ڕەشید | ملکۆ کەلاری |
| ٣٨. منداڵانی گەڕەک | هیوا قادر | |
| ٣٩. مرۆڤی یاخی | ئەلبێر کامۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٤٠. پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی... | هێرش جەوهەر مەجید | |
| ٤١. مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢) | فریشتە نورائی | هەورامان فەریق کەریم |
| ٤٢. سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨) | توانا ڕەشید کەریم | |
| ٤٣. شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨) | هەوراز جەوهەر مەجید | |
| ٤٤. کتێبی پەراوێزنووسان | عەتا محەمەد | |
| ٤٥. فیکر و دونیا (بەرگی ١) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٦. فیکر و دونیا (بەرگی ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٧. دین و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٨. کتێب و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٩. کۆمەڵگەی ڕەش | د. عادل باخەوان | |
| ٥٠. زستانێکی درێژ | کولم تویبێن | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥١. فرانسیسکۆس قەدیسی من | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥٢. ئاهەنگی تەگەکە | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەلیل کاکەوەیس |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٣. شەوی لیشبۆنە | ئێریش ماریا ریمارک | کەریم پەڕەنگ |
| ٥٤. من و ئەو | ئەلبێرتۆ مۆرافیا | کارزان عەلی |
| ٥٥. میرنامە | جان دۆست | سەباح ئیسماعیل |
| ٥٦. روخسارە بەندکراوەکەم | لەتیفە | رووناک شوانی |
| ٥٧. قەپێلک | مستەفا خەلیفە | هەورامان وریا قانع |
| ٥٨. خەونی پیاوە ئێرانییەکان<br>کەوتنی بۆرە قەڵا | ماردین ئیبراهیم | |
| ٥٩. گرگن | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٦٠. ١٩٨٤ | جۆرج ئۆروێل | حەکیم کاکەوەیس |
| ٦١. سوور و رەش | ستاندال | سیامەند شاسواری |
| ٦٢. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٦٣. جادەی مێخەک (١) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٤. جادەی مێخەک (٢) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٥. ئێوارستان | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٦٦. دارستانی نەرویجی | هاروکی موراکامی | تارا شێخ عوسمان |
| ٦٧. ئێوارەی پەروانە (چ٦) | بەختیار عەلی | |
| ٦٨. شاری مۆسیقارە سپییەکان (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٩. مەرگی تاقانەی دووەم (چ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٠. کۆشکی باڵندە غەمگینەکان (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٧١. تا ماتەمی گوڵ...<br>تا خوێنی فریشتە (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٢. سێوی سێهەم (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٣. ئاورەکەی ئۆرفیۆس | بەختیار عەلی | |
| ٧٤. غەزەلنوس و<br>باغەکانی خەیاڵ (چ٢) | بەختیار عەلی | |

| | | |
|---|---|---|
| ٧٥. ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٧٦. دواهەمین هەناری دونیا (چ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٧. ئێمەی پەنابەر | کۆمەڵێ نووسەر | |
| ٧٨. گرەوی بەختی هەڵاڵە (چ٢) | عەتا نەهایی | |
| ٧٩. عێراقییەک لە پاریس | سەمۆئێل شەمعون | سەباح ئیسماعیل |
| ٨٠. جیهانی سۆفیا و فەرهەنگی سۆفیا (چ٤) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨١. کچەی پرتەقاڵ (چ٣) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٢. لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنییەکدا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٣. کچی بەڕێوەبەری سێرک (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٤. نهێنی یاری کاغەز (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٥. مایا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٦. ئینسایکلۆپیدیایەکی مێژوویی وێنەدار | کۆمەڵێ نووسەر | هەورامان وریا قانع |
| ٨٧. کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا | د. حامد مەحمود عیسا | زرار عەلی |
| ٨٨. دوالیزمی دژیەک لە هۆنراوەلیریکییەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی دا | لهۆن قادر | |
| ٨٩. فەلسەفەی ئایین (چ٢) | ئازاد قەزاز | |
| ٩٠. سایکۆپۆلیتیک (چ٢) | ئازاد قەزاز | |
| ٩١. خۆت بناسە | ئازاد قەزاز | |
| ٩٢. مەسیح لە خاچ دەدەنەوە (چ٢) | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |

٩٣. قەدەغەشکێنی (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن
٩٤. گەڕان بەدوای نەمرییدا (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن
٩٥. پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن
٩٦. فەلسەفەی بوون د. محەمەد کەمال
٩٧. وەک ڕووبارە بەخووڕەکە پاولۆکۆیلۆ سیروان مەحمود

